# تـــــاگــــوور
# و
# ویــــــژدانی مــــــرۆیـــــی

رامین جەهانبەگلو

وەرگێڕانی
یـــادگار حەمەغەریب

کوردستان — هەولێر
٢٠٠٥


**ناوی کتێب:**
**تاگوور و ویژدانی مرۆیی**
– نووسینی: رامین جەهانبەگلو
– وەرگێڕانی: یادگار حەمە غەریب
– نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
– بەرگ: هۆگر سدیق
– سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
– تیراژ: ٧٥٠ دانە
– ژمارەی سپاردن: ( ٤١٧ )
– چاپی یەکەم
– نرخ: ١٠٠٠ دینار
– چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب – ٣١ – ( ٣٤ )



ناونیشان
دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی
پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com
ژمارەی تەلەفۆن: 2260311
www.mukiryani.com

# ناوەڕۆك



# پێشگوتە

ویل دورانتی مێژوونووس لە كتێبێكدا رابیندرانات تاگوور بە كەسایەتییەكی بێوێنەی ئەم سەردەمە ناو دەبات.[1] دەتوانین چەند وشەیەك بخەینە سەر ئەم قسەیە و بڵێین زەحمەتە بتوانین مێژووی هاوچەرخ، لانی كەم سەدەی بیستەم بە بێ تاگوور تەسەوڕ بكەین. سەرەڕای ئەوە تاگوور لە ئێراندا ئەوەندە ناسراو نییە. ئەوانەی بەرهەمەكانی ئەویان بە زمانی فارسی خوێندۆتەوە دەزانن ئەو ڕۆماننووس و شاعیرێكی گەورەیە. ڕۆشنبیرانی ئێرانیش وەك كەسێك كە خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیی لە ١٩١٣ وەرگرتووە دەیناسن. بەڵام تاگووری وێنەكێش، مۆسیقاژەن، پەروەردەكار، وتارنووس و تیۆروانی گفتوگۆی شارستانیەتەكان لە ئێراندا ناسراو نییە. هزری بەربڵاوی تاگوور كە جەخت لەسەر چەمكی «یەكبوونی مرۆڤایەتی» دەكاتەوە ئەوی وەكو مامۆستایەكی مەعنەویی نەك هەر لە ئاستی زێدی خۆی (هیندستان) بەڵكو لە ئاسیا و ئەوروپا و ئەمریكاش بە ناوبانگ كرد. بەڕاستی تێگەیشتنی تاگوور بۆ مرۆڤ —كە خولیای هەموو بەرهەمەكانیەتی، یەكێكە لە كاریگەرترین و ڕاستگۆترین گوزارشت بۆ ژیان لە سەدەی بیستەمدا. تێگەیشتنی

1 Will Durant: The Story of Civilization, vol. 1: “Our Oreintal Heritage”, New York, Simon & Shuster, 1954, p. 621.

مەعنەویی تاگوور بۆ ئەم چەرخەمان لە هەموو بەرهەمەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە، و بونیادی هزری شاعیر بەرهەمی ئەزموونی ئەوە لە هەقیقەت و ڕوانگەی تایبەتی ئەو بۆ مرۆڤ و گەردوون. هەر لەبەر ئەوە هونەر و فەلسەفەی تاگوور دەکەوێتە ژێر چەتری مرۆڤناسییەکی سەرتاپاگیرەوە.

تێگەیشتنی تاگوور بۆ مرۆڤ لەسەر ئەو گریمانە وەستاوە کە مرۆڤ پەیتا پەیتا لە نزمترین فۆرمی ژیانەوە بۆ بەرزترین فۆرم گەشەدەستێنێ. کەواتە، ئادەمیزاد لە پلەی مرۆڤێکی جەستەییەوە بۆ پلەی مرۆڤێکی شەخسی پەرەدەستێنێ تا لە ئەنجامدا «زۆرتربوونی» دەروونی خۆی وەدەست بێنێت. لە قۆناغە جۆراوجۆرەکانی ئەم وەرچەرخانەدا پەیوەندییەکان دەگۆڕێن و مرۆڤ لە میانی فراوانبوونی پەیوەندییەوە سەرنج دەدات کە « خاوەن ڕۆحێکە گەنجینەیەکی «زۆرتر»ی تێدایە کە چەند بەرامبەر لە پێداویستییە بایۆلۆژییە ئاژەڵییەکانی مرۆڤ دەوڵەمەندترە».[2] هەروەها پێیوایە شارستانییەتی مرۆڤایەتی لەسەر بنەمای ئەو «زۆرتربوون»ەی ناخی مرۆڤ دامەزراوە و سەرچاوەی هونەریش هەر تیایدایە، چونکە هەموو داهێنانێکی مرۆڤ لەوەوە سەرچاوەی گرتووە و هەر ئەو «زۆرتربوونە» مرۆڤ بەرەو ژیانێکی داهێنەرانە دەبات. کەواتە داهێنەرێتیی مرۆڤ یەکێك لە تواناکانی

2 R. Tagore: The Religion of Man, Beacon Press, Boston 1961, p. 43.



«زۆرتربوونی» ناخمانە. «هەر پەیوەندییەکی زیندووی نێوان مرۆڤ و مرۆڤ بە شێوەیەکی سروشتی لە بەرهەمێکی هونەریدا بەرجەستە دەبێت».[3] لەو ڕووەوە هونەر بە دوای یەکبوون و گونجان لەگەڵ ناخی خۆ و لەگەڵ جیهانی دەوروبەردا دەگەڕێت. جگە لەوە هونەر دەتوانێت پەیوەندیی نێوان مرۆڤ لەگەڵ هەموو شتەکانی تردا ڕێکبخات، چونکە لە مرۆڤدا تێگەیشتنێکی قووڵ بۆ ڕاستی سەرچاوەی گرتووە. تاگوور باسکردنی هونەر بەرەو ئاقارێکی بەرفراوانتر ڕادەکێشێت و دەڵێت هونەر دەربڕی یەکبوونی زاتی مرۆڤە. تایبەتمەندیی داهێنەرانە و هونەریانەی مرۆڤ پرەنسیپی یەکبوون لە مرۆڤدا زیندوودەکاتەوە. هونەرمەند بە هۆی سەرتاپاگیری بەخشین بە پەیوەندییەکان بەسەر فرەیی و چەند لایەنبوونی بارودۆخەکاندا زاڵ دەبێت و بە یەکبوون لەگەڵ هەقیقەت دەگات، و لە کۆتاییدا هونەر بۆ مرۆڤ ئاشکرا دەکات کە «هەقیقەت لەسەر بنەمای واقیعەکان دانەمەزراوە، بەڵکو لە گونجان لەگەڵ ئەودا دەردەکەوێت».[4] تاگوور پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لە نێوان هەقیقەت و جوانیدا بەدی دەکات. وەك ئەو دەڵێت لەم پەیوەندییەدا دەتوانین «توانای بێ سنووری ئەبەدییەت لە تێپەربوونی ساتەکانی تەمەندا»[5] ببینین.

3 R. Tagore: Creative, Unity, Macmillan, 1ndian 1962, p. 115.
4 1bid, p. 32.
5 1bid, p. 201.

بە ڕای تاگوور ئایین، ئاشکراکەری هەست و تێگەیشتنێکە لە «کەسایەتی گشتی و جیهانگیر». بە وتەیەکی تر، مرۆڤ بە هۆی ئایینەوە بە دوای پانتایی خەیاڵێك بۆ منی ڕاستەقینەی خۆیدا دەگەڕێ. ژیان بەردەوام لە گۆڕاندایە و ڕیفۆرم وەردەگرێ و لە هەوڵی چاکسازی و گونجانێکی تازەدایە تا لە کۆتاییدا «بە دونیای باڵای مرۆڤایەتی بگەین.»[6] بۆیە دەڵێت تەنیا بەهۆی گۆڕان و ئومێدەواری دەتوانین ڕێز لە توانا و ئیعتیباری ڕۆح بگرین. تازەکردنەوەی ئامانجەکانی مرۆڤایەتی دروست نابێ مەگەر ئەوەی بە گوێرەی گۆڕانەکانی سەردەم گۆڕانی بەسەردا بێ. ژیانی خوازراو لە چاوی تاگووردا بەرجەستەبوونی عاریفانەی جیهانە لە سەرزەمینی یەکبووندا و لە ڕەوتی پەرەسەندنی شادیبەخشدا. مەبەستی تاگوور لە «یەکبوون» هاودەنگیی و هاوئاهەنگییە لە نێوان کۆتا و ناکۆتادا. ئەو کاتەی هۆشیاریی تاکەکەسی لە عەشقدا بگاتە لوتکەی خۆی ئەم «یەکبوونە» دێتەکایەوە. ئەمەیە بەرجەستەبوونی هەقیقەتی یەکبوون، یەکبوونی ڕۆحمان لەگەڵ جیهان و ڕۆحی جیهان لەگەڵ ناکۆتادا. ئەمەیە گەیشتن بە ئیشراقی عاریفانەی ڕاستەقینە یان ئەو شتەی تاگوور پێی دەڵێت ژیان لە ناکۆتادا Brahmavihara. وە ئەو کاتەی مرۆڤ گەیشتە پانتایی

6 R. Tagore: A Vision of Indian History, Visva Bharati, Calcutta 1951, p. 36.



ئیشراق، تامی چێژی یەکبوون دەکات و هاودەنگ لەگەڵ شاعیر دەڵێت:

*ناخ و دەرەوە وەك ئاسمان بوونە یەك (کۆتا و ناکۆتا لە ڕێکەوتن و گونجاندان) و من لە سەیرکردنی ئەمانەدا مەستم*[7] کەواتە ئەو وا باسی هەقیقەت دەکات کە خۆی دەیبینێت و بەم شێوەیە ڕابیندرانات تاگوور ئیلهامبەخشی ئەو کەسانەیە کە باسی پەرەسەندنی مەعنەویانەی ڕەوشی مرۆڤ و یەکبوونی جیهان لە میانەی گفتوگۆی شارستانییەتەکاندا دەکەن.

زۆربەی تۆژینەوەکانی ئەم کتێبە لە هیندستان و کەنەدا ئەنجامدراون و لە میانەی ئەم تۆژینەوەیەدا چەند مرۆڤێکی خۆشەویست و بەڕێز یارمەتیان داوم کە پێویستە سوپاسیان بکەم. بەتایبەت خۆم بە قەرزاری ڕێنماییە دەوڵەمەند و بە سوودەکانی ڕاج موهان گاندی و ئەشیش نەندی دەزانم. هەروەها پێویستە یادی ئایزایا بەرلین بکەمەوە و یادی بەخێر کە لە دوایین دیدارماندا لە کانوونی دووەمی ١٩٩٧ ئیلهامبەخش و هاندەرم بوو بۆ دانانی ئەم کتێبە.

**ڕامین جەهانبەگلو**

**تۆرێنتۆ — کانوونی یەکەمی ١٩٩٩**

7 R. Tagore: Personality, Macmillan, London, 1965, p. 71.

## پێشەکی

# گۆتەی هیندستان

**ئەم فەیلەسووفەی دەرکەوتەی رەسەنایەتی و هاو ئاهەنگی، ئەم گۆتەی هیندستان، نەك تەنیا موڵکی نەتەوەی خۆی بەڵکو موڵکی گشت مرۆڤایەتییە .**

**ئەلبێرت شوایتسەر**

رابیندرانات تاگوور ڕوخسارێکی ئاشنایە، بەڵام بەو شێوەی دەبوایە بناسرایە نەناسراوە. زۆربەی خەڵك بەناو و سیمای یەکەمین براوەی خەڵاتی نۆبڵی ئاسیا لەگەڵی ئاشنان. کۆمەڵێکیش دەیخەنە ریزی کەسایەتییە نامۆو نەناسراوە عیرفانییەکانەوە و وەك قەشەیەك یا ڕێبەرێك لە دوورەوە ریزی لێ دەنێن. بەڵام هەر ئەم جۆرە مامەڵەکردنە نیشانەی نەناسینی ئەوە.

لە فەرەنسا، لە سەردەمی ڕۆمن رۆلانەوە تاکو ئەمڕۆ بە کەمی نووسین لە بارەی تاگوورەوە بڵاوکراونەتەوە. ئایا لەبەر ئەوەی وادەزانرێت کە تاگوور بیرمەندێکە سەردەمیی بەسەرچووە و ئیتر شایەنی لێکۆڵینەوە نییە؟ هۆی ئەم بایەخ نەدانە روون و سادە نییە. بەڵام دەبێت ئاماژە بەوە بکرێت کە بیر و بۆچوونەکانی تاگوور رەهەند و پێچ و پەنای بەرچاویان



تێدایە، هەر لەبەر ئەوە ئەمرۆش وەك رابردوو ڕووبەڕووی سەختی و دژواریمان دەکەنەوە.

هەرچەندە تاگوور وەکو مەهاتما گاندی سەربازی سەرهەڵدانی سەربەخۆیی هیندستان نەبوو، بەڵام بێ دوو دڵی یەکێکە لە بنیاتنەرانی هیندستانی نوێ. تاگوور لە ناوەندی بیری هاوچەرخی هیندیدا جێگەی هەیە. ئەدەبیاتی هیندی بە قۆناغی پێش تاگوور و دوای تاگوور دابەش دەکرێت. سەرەڕای ئەمەش، ناوی تاگوور بە شێوازێکی تازەی فێرکردنەوە گرێ دراوە، کە چەند کەسێکی بەناوبانگی تیۆروانی (تیۆریستی) بواری پەروەردە و فێرکردنی هاوچەرخ لەوانە ئیلیچ، فێرنیت، مۆنتە سوری بە ئاشکرا لەژێر کاریگەری ئەو دان. لەم رووەوە، لەبەرچاونەگرتنی کەسێتی تاگوور بە بایەخ نەدان بە مەسەلە زۆر گرینگەکانی فەلسەفە و پەروەردە و فێرکردنی ئەم سەردەمە لەقەڵەم دەدرێت. تاگوور لە سەردەمێکدا دەرکەوت و کەوتە کار کە دنیا بە شێوەیەکی قووڵ و بێ وێنە لەبەردەم گۆڕانێکی گەورە دابوو. ئێستا پێویستە لە خۆمان بپرسین رابیندرانات تاگوور چۆن و تا چەند دەستی لەو گۆڕانانەدا هەبووە و لەو سەردەمەدا چ رۆڵێکی بینیوە. خستنەرووی گشتی هێڵە سەرەکییەکانی ژیان و کەسایەتی تاگوور و بانگهێشتی هزری مەعنەوی و مرۆڤدۆستانەی (هیومانیستی) ئەو ڕێخۆشکەرێك دەبێت بۆ ئێمە تاوەکو تێرامانەکان و حکوومدانی (داوەریکردنی) جیهانیانەی ئەم کەڵە پیاوە لە بارەی شارستانییەتی خۆمانەوە باشتر بناسین.

## بەشی یەکەم

### پیاوماقوڵی بەنگاڵی

**ئەو بەم شێوەیە ناوی لێدەنرێت: رابیندرا- رۆژ- چونکە لە داهاتوودا وەك رۆژ بە دەوری جیهان دا دەسوڕێتەوە و دنیا رووناك دەکاتەوە.**
**دڤیندرانات تاگوور[1] _ باوکی شاعیر**

رابیندرانات تاگوور لە شەشی مانگی ئایاری ١٨٦١(بەرامبەر رۆژمێری بەنگاڵی دەکاتە ٢٥ ی بیساکی ١٢٦٨) لە شوێنی نیشتەجێبوونی بنەماڵەی تاگوور لە جواراشانکو[2]، کە دەکەوێتە شاری *کلکەتە*وە لە دایك بووە. لەگەڵ ئەوەی کە بنەماڵەی تاگوور پەیوەست بە کاستی براهمان و لە پیاوماقوڵەکانی کوساری[3] بوون، بەڵام لە کۆمەڵەی براهمانەکانی پیراڵی[4] دەژمێردران - کەسانێك کە

1 Devendranath Tagore
2 Jorashanko
3 Kusari
4 Pirali



بەپەیوەندی لەگەڵ موسڵمانەکاندا تێوەگلا بوون. بەگوێرەی چیرۆکێك کە بۆ دوو سەدە لەمەوبەر دەگەڕێتەوە، ئەندامانی بنەماڵەی تاگوور بەناچاری پەنایان بردۆتە بەر گۆشت خواردن، لە لایەن ئەندامانی دیکەی *کاست*[5]ی خۆیان وەك ناپاکەکان رەتکراونەتەوە. ستەمی ئایینییان کە لێکرا، هەروەها لەدەستدانی پایەی کۆمەڵایەتی، تاگوورەکانی ناچارکرد کە زەوی باب و باپیرانیان بەجێ بهێڵن و پەنا بۆ گوندی گۆڤند پوور[6]، لەکەناری رووباری گونگ بەرن. بەم شێوەیە تاگوورەکان پیشەیەکی تازەیان بۆ خۆیان هەڵبژارد و بەکاری بەرێکردنی کەشتییە بیانییەکانەوە لە رووبارەکەدا خەریك بوون و بە نازناوێکی رێزداری وەك «تاکور»ەکان لە ناو خەڵکدا ناسران کە دواتر بە ناوی ئینگلیزیانەی تاگوور ناویان دەرکرد. وردە وردە تاگوورەکان بوونە خاوەنی زەوی و زار و دەوڵەمەند بوون و وەك خێزانێکی زۆر زانا و خاوەن دەسەڵات لەناو پیاوماقووڵانی بەنگاڵیدا جێگەی خۆیان کردەوە. باپیری رابیندرانات کە ناوی دوارکەنەت[7] (١٧٩٤-١٨٤٦) پیاوێکی زۆر زانا بوو. لە بەشی ماف لە ئینگلترا خوێندبووی و یەکەمین کەسایەتی هیندی بوو کە بووە ئەندام و بەڕێوەبەری کۆمەڵەی

5 کاست سیستمێکی کۆمەڵایەتییە لەسەر بنەمای جیاوازی لە سەرچاوەی خێزانی، پلەداریی پیشەیی و سەروەت و سامان دامەزراوە و زێتر بۆ جیاوازیی چینایەتی لە هیندستان بەکار دێ.
6 Govindpur
7 Dwarkanath

ئاسیایی بەنگاڵ. دوارکەنەت لەگەڵ راج رامۆهان[٨]، چاکسازیخوازی ئاینیی بەناوبانگ و دامەزرێنەری بزووتنەوەی برەهمۆ ساماج[٩] هاوکاری و دۆستایەتی و پەیوەندییەکی نزیکی هەبوو. ئامانجی بزووتنەوەی برەهمۆ ساماج گونجاندنی ئایینی هیندۆسی بوو لەگەڵ پێویستییە دونیاییە هاوچەرخەکاندا. ژیانی هاوسەرێتی دوارکەنەت لەگەڵ ئافرەتێکدا لە کۆمەڵەی ڤیشنویی[١٠] بووە هۆی ئەوەی یەکەمین منداڵی ئەوان دوندرانات، باوکی رابیندرانات، لە کەشوهەوایەکی وشکی پیرۆزانەی ئایینیی ڤیشنوییدا رابێت. بەڵام دوندرانات تاگوور سەرەڕای پەیوەستبوونی بە ئایینەوە، هەڵوێستێکی ئازادیخوازانەی بەرامبەر بە کاستەکان هەبوو و لەگەڵ شوکردنەوەی بێوەژنەکان بوو، کە بێگومان لە کۆمەڵگەی نەریتیی هیندیدا پەسند نەدەکرا. بۆیە ئەویش رێگەی باوکی گرت و لەسەر رێبازی برەهمۆ ساماج مایەوە. لە سالأنی ١٨٥٠ دا، دوندرانات تاگوور لە کەسایەتییە بەرچاوەکانی ئەو بزووتنەوەیە دەژمێردرا. ئەویان بە ماهارشی[١١] واتە زانای گەورە بانگ دەکرد. ماهارشی تێکەڵێك بوو لە موڵکدارێکی ئازا و زیرەك و عارفێك کە ئیلهامی لە ڤوداکان و ئۆپانیشادەکان وەرگرتووە. دوندرانات بووە خاوەنی چواردە منداڵ. دوایەمین منداڵ رابیندرانات

8 Raj Rammohan

9 Brahmo Samaj

١٠- یەکێك لە خواکانی ئایینی هیندۆسییە.

11 Maharshi



بوو. دوی جندرانات[١٢]، گەورەترین کوڕی مەهارشی، رۆشنبیرێکی گەورە بوو، ماتماتیکزان و فەیلەسووفێك بوو کە توانایەکی سەرسامکەری لە شیعر و مۆسیقادا هەبوو. رابیندرانات لە کتێبی *یادەکان*[١٣]دا باسی زانیارییەکانی برا گەورەکەی دەکات. بەڵام دوی جوندرانات تاکە منداڵی بە توانا و دەنگ خۆشی ئەو بنەماڵەیە نەبوو. رابیندرانات زۆر بەختەوەر بوو لەوەی کە لە سەردەمی منداڵیدا لە بایەخپێدان و یارمەتی خوشك و برا لێهاتوو و بەتواناکانی سوودمەند بێت. لەناو خوشك و براکانیدا دەبێت ناوی جیۆتیرندرانات[١٤] ببرێت کە ئەرکی راهێنەری بچووکترین برای لە ئەستۆ گرتبوو. بە قسەی ولیام رۆتنشتین[١٥]، هاورێ و سەرپەرشتکاری رابیندرانات لە رۆژئاوادا، جیۆ تیرندرانات لە ناو هونەرمەندانی ئەو سەردەمی هیندستان جێگەی خۆی هەبوو. لەم رووەوە رۆتنشتین کە بۆ خۆشی وێنەکێش بوو، زۆر هانی جیۆتیرنداناتی دا لە بڵاوکردنەوەی کتێبێکی وێنە قەڵەم خەتییەکانی. جگە لە هونەرەکانی تریش، جیۆتیرندرانات وەك براکانی تری تاگوور مۆسیقاژەنێکی بێ هاوتا بوو، چەندان جۆر سازی لێ دەدا و شانۆی هەمەڕەنگی نمایش کرد. لە سالأنی مێردمنداڵیدا هیچ شتێك

12 Dwijendranath

13 Rabindranath Tagore, *Reminiscences*, New Delhi, 1987, p. 122.

Čd' - ساتیا جیت رای، دەرهێنەری فیلمی بەناوبانگی هیندی لە فیلمی *شارولاتا* ئەم پەیوەندییە سۆزدارییەی وێناکردووە.

15- Kadambari

چێژی لەوە خۆشتر نەبوو کە لەگەڵ برا و براژنەکەیدا بەناوی کادام باری[١٦] ژیان بەسەر بەرێت. کادام باری کە براژنی رابیندرانات بوو وەك هاورێی وابوو و ئەو کەسەش بوو کە دەیتوانی رازەکانی "مێرد منداڵی" لا بدرکێنێ -کادام باری نهێنی پارێزی رابیندرانات بوو. بەڵام ئایا پەیوەندی سۆزداری لە نێوان رابیندرانات و براژنەکەی لە سنوورێکی رێپێدراودا راوەستا؟[١٧] وەك دەزانین لە دوای مردنی دایکی رابیندرانات لە ساڵی ١٨٧٥ ئەم پەیوەندییە شێوەیەکی بەهێز و تامەزرۆی وەرگرت. لە کاتێکدا کە ئارەزووی مۆسیقی رابیندراناتی لە براکەی جیۆتیرندرانات نزیك دەکردەوە، کادام باری بەدەنگی ژنانە و بەهرەی لە ئەدەبیاتدا ئەم ئیمتیازەی بەدەست هێنا کە یەکەمین گۆرانیبێژی شیعرەکانی تاگووری لاو بێت. تاگوور نازناوی هێکات -[١٨] (خواوەندی شەو) بە ئەو بەخشی و کادام باری هەمیشە شاعیرەکەی بەناوی بهانۆ[١٩] = رۆژ بانگ دەکرد. لە بیرمان نەچێت رابیندرانات یەکەمین کۆمەڵە هۆنراوەی لە ساڵی ١٨٧٧ بە نازناوی بهانۆ سینگ[٢٠] بڵاوکردەوە. ئەم هۆنراوانە یەکەمین جار لە بڵاوکراوەیەکی بەنگاڵی

16- Kadambari

Œ- ساتیا جیت رای، دەرهێنەری فیلمی بەناوبانگی هیندی لە فیلمی *شارولاتا* ئەم پەیوەندییە سۆزدارییەی وێناکردووە.

18- Hecate

19- Bhanu

20- Bhanu Singh



بەناوی بهاراتی[٢١] چاپکران. دوو برای تاگوور ئەم بڵاوکراوەیان بەڕێوە دەبرد. خاڵێك لەم بارەیەوە شایەنی باسکردنە: لەبەر ئەوەی گومان دەکرا ئەم هۆنراوانە هی شاعیرێکی پیری ڤیشنویی لە خزمەکانی خێزانی تاگوور بێت نەك بەرهەمی رابیندراناتی منداڵە بچووکی مەهارشی، دکتۆر شاترچی[٢٢] ئەوەی لە نامەی دکتۆراکەی خۆی لە زانکۆیەکی ئەڵمانیدا باسکردووە. بەم شێوەیە رابیندراناتی لاو پێی ناوە نێو کۆڕ و کۆمەڵە ئەدەبییەکانی بەنگاڵ. ئەم سەرکەوتنە بووە هۆی ئەوەی لە بڵاوکراوەی بهاراتیدا ستوونێکی ئازادی بۆ دابنێن تاوەکو بەهرەی شاعیرێتی خۆی نیشان بدات. بەڵام تاگووری لاو لەم سنوورەدا نەوەستا و لە مەیدانی شیعر و شاعیریدا زۆر بەرەو پێشەوە چوو. لە هەمان سەردەمدا یەکەمین چیرۆکەکانی وەك «بهی کاینی»[٢٣]- (خزمەتکاری سواڵکەر) و هەروەها رۆمانی مێژوویی «کارونا»[٢٤]- (دڵسۆزی) نووسی. بەهەمان شێوە توانای خۆی لە بواری رەخنەی ئەدەبیدا پیشان دا و لە ساڵی ١٨٧٨ چەندین وتاری شیکردنەوەی لە بارەی دانتە، گۆتە، پترارك و ئەدەبیاتی ئەنگلۆ ساکسۆن پێشکەشکرد. تاگووری لاو هەر لەوساڵەدا بە ویستی باوکی بەرەو ئینگلتەرا بەرێکەت. براکەی ساتی ئەندرانات[٢٥]، کە کارمەندی

21- Bharati

22- Chatterjee

23- Bhikarini

24- Karuna

25- Satyendranath

حکوومەت بوو لەم سەفەرەدا لەگەڵیدا بوو. تاگوور لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا هیچ شتێکی دەربارەی داب و نەریتی ئینگلتەرا نەدەزانی. ئینگلتەرای ئەو سەردەمە لەگەڵ ئینگلتەرای سەردەمی باپیریدا جیاوازییێکی گەورەی هەبوو. دوار کنت شایەدی شان و شەوکەتی دەرباری ڤیکتۆریا بوو، لە کاتێکدا کە رابیندرانات لە پانسیۆنێکدا دەژیا و تەنیا لەگەڵ بەنگالییەکاندا هەڵسوکەوتی دەکرد. ئەو نامانەی لەو سەفەرەدا بۆ بڵاوکراوەی بهاراتی ناردی دواتر وەکو کتێبێك لەژێر ناونیشانی نامەی گەشتیارێك لە ئینگلتەرا[٢٦] بڵاوکرایەوە، تێگەیشتنی تاگووری لاو لە ئینگلتەرای ئەو سەردەمەدا بۆ ئێمە دەردەخات. هەر چۆنێك بێت مانەوەی تاگوور لە ئینگلتەرا زیاتر لە هەڤدە مانگی نەخایەند. بەڵام هەر ئەو ماوەیە کەمە بەس بوو تاوەکو بە ئەدەبیاتی ئینگلیزی ئاشنا بێت. تاگوور لەو ماوەیەدا لە وانەکانی هێنری مۆرلی[٢٧] دەربارەی شکسپیر لە زانکۆی لەندەن ئامادە دەبوو. بە هەمان شێوە لە کۆبوونەوە کراوەکانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی بەریتانیا و وتارەکانی گلادستن[٢٨] ئامادە دەبوو. ئەم یەکەمین ئەزموونەی سیاسی — کولتووریی، بیست ساڵ دواتر لە هزری گفتوگۆی رۆژهەڵات و رۆژئاوادا خۆی دەرخست. ئەگەر چی لە سەرەتای یەکەم سەفەرەکەیدا بۆ ئینگلتەرا تاگوور لە وتارێکیدا بوێرانە ئارەزووی خۆی بۆ

26- Yurop Pravasis Patra

27- Henry Morley

28- gladeston



دروستکردنی پردێك لە نێوان شارستانیەتەکاندا دەربڕی: «سروشتی گشتگیری ئەورووپییەکان و کۆنەپارێزیی هیندییەکان، پانتایی خەیاڵی رۆژهەڵاتییەکان و ئاوەزی پراکتیکی رۆژئاوا، لە تێکەڵبوونی نێوان ئەو دووانە چ هێزێکی رۆحی تێر و تەواو دەر دەکەوێت!»[٢٩] لەوانە بوو باوکی تاگوور بیرۆکەی ئەم جۆرە تێکەڵکردنە بە زەحمەت پەسەند بکات. مەهارشی کە لەو بڕوایە دابوو بەهاکانی رۆژئاوا زیاد لە پێویست کاریگەرییان لەسەر کوڕەکەی داناوە، نیگەرانی داهاتووی کوڕەکەی بوو بۆیە بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ نیشتمان. تاگوور لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٨٠ گەڕایەوە بۆ هیندستان.

رابیندرانات، هەر کە گەڕایەوە بۆ ماڵی باوکی، دەستیکردەوە بە هۆنینەوەی هۆنراوە و دانانی ئاواز. لە بەرهەمەکانی ئەو سەردەمەدا دەبێت ناوی دوو بەرهەم بێنین: *دڵی شکاو*[٣٠]، و ئۆپێرایەك بە ناوی بلیمەتایەتی ڤالمیکی[٣١] کە بە هاوکاری براکەی جیۆتیریندرانات هاتە بەرهەم. لە ١٨٨٣دا کە لەگەڵ براکانی و خێزانەکانیان چوونە کاروار[٣٢]، نزیك گوا[٣٣]، دەستی بە نووسینی یەکەمین درامای شیعری کرد. ئەو بەرهەمەی کە ناوی نا تۆڵەسەندنەوەی سروشت، یەکەمین

29- Krishna Duttam, Andrew Robinson: Rabindranath Tagore The Mrinad-Mridedman, Bloomsbury, London, 1995, p. 77.

30- Bhagana

31- Valmiki Pratibha

32- Karwar

33- Goa

تامەزرۆیی تاگووری لاوی بە فڕین لە دنیای عیرفان و گەڕان لە ئاقارەکانی میتافیزیکدا پیشان دەدات. سالأنێك دواتر لەبارەی ئەم بەرهەمەوە وترا: «لەوانەیە لە حوکمی پێشەکییەکدا بێت بۆ هەموو بەرهەمە ئەدەبییەکانی دواتیان، چونکە لە بابەتێك دواوە کە چەقی هەموو بەرهەمەکانی دیکەیەتی -گەیشتن بە ناکۆتا لە کۆتادا.»[٣٤]

تاگوور سەرەڕای کارە زەینییە جۆراوجۆرەکانی، لە نووسینی دەقی شانۆ و رۆمان و هۆنینەوەی هۆنراوە درێغی نەکردووە. لە تشرینی دووەمی ١٨٩٠دیوانە شیعرێکی بە ناوی ماناشی[٣٥] بڵاوکردەوە. زۆرکەس لەو سەردەمەدا رەخنەیان لە کتێبی ماناشی گرتووە و ئەویان بە بێ هیوا و نا ئومێدکەر ناوزەد کرد. بەڵام بە رای تاگوور، ناکۆکی و رووبەڕووبوونەوەی نێوان ئومێد و نا ئومێدیی شتێکی زۆر ئاڵۆزە و بابەتێکە خۆی لە خۆیدا زۆر قووڵە. وەك ئەو دەڵێ: «هەست دەکەم مەیدانێکی شەڕ لەمندا هەیە کە تیایدا دوو هێزی دوژمنکار بەردەوام لە شەڕ دان. دەڵێی وزەی ماندونەناس و ویستی پراکتیکیی رۆژئاوا ، قەڵای ئارامبەخشی هیندیی من تووشی مەترسی دەکات. ئەم گفتوگۆ و دەمەقاڵێ هەمیشەییە گرفتاری حاڵەتێکی رۆحیم دەکات کە تێکەڵێکە لە ناکامی و سەرەڕۆیی و نائومێدی»[٣٦].

34- Idid, p. 84.

35- Manashi

36- Idid, p. 107.



دیسانەوە سەیر دەکەین کە تاگوور لە لایەکەوە پەیوەستە بە هزری هیندییەوە و لە لایەکی تریشەوە شێتی مۆدێرنیتەی رۆژئاوایە. ئەم حاڵەتە رۆحییە لە ماوەی چەندەها ساڵ هزری تاگوور بە دەرەنجامێك دەگەیەنێت تاوەکو لە ئەنجامدا ئاوێتەیەك لە نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا هەڵبێنجێت. تاگوور لە سەرەتای خستنەڕووی ئەم ئاوێتەیە (سێنتز)دا شێلگیرانە ڕایگەیاند کە پێگەی جێگیری ئەو لە بواری فێرکاریدایە. بۆیە بۆ ئەزموونکردنی مەبەستە فێرکارییەکانی خۆی ژینگەیەکی گونجاوی هەڵبژارد-شانتی نیکتان بە واتای ئارامگە. شانتی نیکتان موڵکی خێزانی تاگوور بوو و رابیندرانات لە ١٨٧٣ دا بۆ ماوەیەك لەگەڵ باوکیدا ئەو ناوچەیەیان بەسەر کردبۆوە. شانتی نیکتان کە کەوتبووە بەردەم شاخی بەناوبانگی هیمالایاوە، لە زەینی تاگووردا دەربڕی نەریتی «ئەشرام»ەکانی زاهیدە هیندییەکان بوو لە ناو جەرگەی دارستانەکاندا. تاگوور ئەوێی بە ماڵی نوێی خۆی دەزانی بۆ ئەوەی لە ئارامی و بێدەنگیدا بتوانێت کاتەکانی بە نووسین و خوێندنەوە بەسەر بەرێت. قوتابخانەی شانتی نیکتان لە تشرینی دووەمی ١٩٠١ دا کرایەوە. قوتابییەکانی قوتابخانەی تاگوور بریتی بوون لە پێنج کوڕی بەنگاڵی (کە یەکێك لەوانە کوڕی تاگوور بوو) و پێنج مامۆستای مەسیحی. شانتی نیکتان لە لایەنی پەروەردە و فێرکردنەوە بە هەنگاوێکی گەورە دەژمێردرا. بەڵام پازدە ساڵی خایاند تاوەکو ناوبانگی تاگوور لەگەڵ ناوی شانتی نیکتان ئاوێتە بوو.

یەکەمین ساڵانی سەدەی بیستەم، خەم و خەفەت و ڕەنجی زۆری لەگەڵ خۆی بۆ تاگوور هێنا. بەدبەختی یەك لەدوای یەك بەسەر ماڵ و حاڵی ئەودا دەباری. لە ساڵی ١٩٠٢ هاوسەرەکەی کۆچی دوایی کرد. لە ١٩٠٣ کچەکەی کە ناوی رینوکا[37] بوو لەدەستدا و لە ساڵی ١٩٠٥ دا باوکی مرد و لەدوای ئەوە جوانترین کوڕی بە ناوی سامیندرانات[38] مرد. مەرگی باوکی تاگوور لە تەمەنی ٨٧ ساڵیدا نیشانەی کۆتایی سەردەمێك بوو چ لە بزووتنەوەی براهمۆ ساماج، چ لە خێزانی تاگووردا کە لە نێوان هیند و ئینگلتەرادا لە بێنە و بەردە دابوو. هەمان ساڵ بەرامبەر بوو بە سەرەتای بزووتنەوەی نەتەوەخوازی کە تاگوور زۆر بە توندی خۆی لێ بە دوور دەگرت و هەڵوێستێکی زۆر ڕەخنەگرانەی لە هەمبەر نواند.

لە ١٩٠٥ تاوەکو ١٩١٢، کە بە ساڵانی سوداشی[39] ناسراوە، شادی لەگەڵ خۆی هێنا و پڕلە خێروبەرەکەت بوو بۆ شاعیر. لە هەمان سەردەمدا تاگوور دیوانی گیتانجالی[40]، بەناوبانگترین کۆمەڵە هۆنراوەی خۆی، و گۆرا[41]، و شانۆنامەیەك بەناوی داك گار[42] (فەرمانگەی پۆستە)، هەروەها یادەکان و کۆمەڵێك نامە بە ناوی روانینێك بۆ

37- Renuka
38- samindranath
39- Swadeshi
40- Gitanjali
41- Gora
42- Dakghar



بەنگاڵ بڵاوکردەوە. گەشەکردنی بیری نەتەوەخوازی (ناسیۆنالیستی) و جوداخوازی لە هیندستان وای لە تاگوور کرد هەر زوو تیۆری ئاوێتەی فەلسەفی - مەعنەوی لە نێوان هیند و جیهانی ڕۆژئاوادا بخاتە ڕوو. لە ساڵی ١٩٠٨ تاگوور لە دوو وتاردا لە کلکتە، بزووتنەوە تیرۆرستییەکانی گەنجانی بەنگاڵی دژی سەربازانی بەریتانی سەرزەنشت کرد و ڕەخنەی لە توندوتیژی کوێرانەی هاونیشتمانییەکانی گرت. تاگوور تیۆری پیلانگێڕی ڕەتدەکردەوە، کە هەموو کێشە و گیروگرفتەکانی وڵاتی هیندستانی دەخستە ئەستۆی بەریتانییەکان، بۆیە بە ئاشکرا ڕای خۆی لەسەر ئەم تیۆرە دەربڕی: «زۆرێك لە ئێمە لەم خەیاڵپڵاوییە(وهم) دا بەسەر دەبەین کە خۆ بەدەستەوەدان و قبووڵکردنی دەسەڵات کە جۆرێکە لە نەخۆشی دەروونیمان، وەك سەرئێشە نییە. بەڵکو ئەمە حکوومەتی بەریتانیایە کە لەسەر ئێمە قورسایی دەکات و بەزۆر تەپەسەرمان دەکات، و بەهەر ڕێگەیەك لە ژێر ئەو بارە گرانەدا ڕزگارمان بێت، بێگومان چارەسەرمان دەبێت. بەڵام مەسەلەکە بەم سادەییە نییە. خۆ بەدەستەوەدان و قبووڵکردنی دەسەڵات لەلایەن ئێمەوە بەهۆی حکوومەتی بەریتانیاوە نییە، بەڵکو نیشانەی نەخۆشی دەسەڵات قبوڵکردنێکی زۆر قووڵترە لە ناخماندا.»

تاگوور هەمیشە وەك کەسایەتییەکی نیشتمانپەروەر و میانڕەو دەرکەوتووە. هەرگیز دژی ڕۆژئاوا نەبوو. خۆشویستنی تاگوور بۆ میراتی کولتووری ڕۆژئاوا و پەرۆشی ئەو بۆ نزیککردنەوەی هەر دوو

دنیای رۆژهەڵات و رۆژئاوا لە یەکتری وای لەو کردووە هەندێ لە نووسینەکانی خۆی بۆ زمانی ئینگلیزی وەربگێڕێت و هەندێ جار هەر بە ئینگلیزی بنووسێت. وەرگێڕانی ئینگلیزیی گیتانجالی تاگووری بە خوێنەرانی رۆژئاوا ناساند و بۆ بواری شاعیرێتی و کارە مەعنەوییەکانی رێخۆشکەر بوو.

لە ٢٧ ی مانگی ئایاری ١٩١٢ تاگوور لەگەڵ کوڕەکەی راتیندرانات[٤٣] و ژن خوشکەکەی پراتیما[٤٤] سەفەری بۆ ئینگلتەرا کرد. ئەم سێیەم سەفەرەی لەگەڵ سەردانەکانی پێشووتری ئەو بۆ ئینگلتەرا جیاوازییەکی سەرەکی هەبوو. سێر ولیام رۆتنشتین، هاوڕێی نزیکی براکانی، کە لەوەو پێش ناومان هێنان، پێشتر شیعرەکانی گیتانجالی لە کۆڕە ئەدەبییەکانی لەندەن ناساندبوو، و دوای هاتنی شاعیر لە ٢٧ی ئایاردا، دەرفەتی بۆ چاوپێکەتنی لەگەڵ ولیام یەتس[٤٥]، شاعیری بەناوبانگی ئێرلەندی رەخساند. شاعیری بەناوبانگی ئێرلەندی کە بەخوێندنەوەی گیتانجالی سەرسام ببوو یەکسەر وەرگێڕانی ئینگلیزیی کتێبەکەی دایە دەزگای بڵاوکردنەوە و هەر خۆشی پێشەکییەکی بۆ نووسی و لە ستایشی ئەو شیعرانەدا تا ئەو شوێنە رۆیشت کە وتی:

43- Rathindranath

44- Pratima

45- William Butler Yeats



«دەمێك بوو لە خوێندنەوەی هیچ بەرهەمێك بە رادەی وەرگێڕانەکەی گیتانجالی رانەچڵەکی بووم.»[٤٦]

گیتانجالی لە ئازاری ١٩١٣ لە شاری لەندەن بڵاوبۆوە. لە ماوەی نۆ مانگدا دە جار چاپکرایەوە. بەم شێوەیە ناوبانگی تاگوور لە سەرتاسەری ئەورووپادا بڵاو بۆوە و لەوەش زیاتر رۆیشت و گەیشتە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. تاگوور دوای ماوەیەکی کەم لە دیدارەکەی لەگەڵ *یەتس*دا بە گەورە پیاوانی تری ئەو وڵاتە لەوانە بەرناردشۆ و بەرتراند راسڵ و ئێچ. جی. وۆلز و عوزرا پۆند ئاشنا بوو. پۆندیش وەك یەتس لە ستایشی ئەودا وتی: «لەم شیعرانەدا لەڕادەبەدەر عەقڵی ساخڵەم و ئامۆژگاریی ئەو شتانەم بینی کە لە پەرێشانی ژیانی رۆژئاوادا فەرامۆشمان کردبوون.»[٤٧]

جێگەی سەرنجە کە کۆمەڵێکی زۆر لە هاوڕێیانی تاگوور لە رۆژئاوا لە نێوان وتەکانی مەسیح و مەعنەوییاتە شاراوە و ئاشکراکانی شیعرەکانی تاگووردا نزیکایەتییەکی سەرسوڕهێنەرییان دۆزییەوە، و گیتانجالییان بە ریوایەتی هیندیانەی ئینجیلەکانیان نایە هەژمار. تەنانەت نەوەی داروین لە کچەکەیەوە، دوای چاوپێکەوتن لەگەڵ

46- Ibid, p. 3.

47- Ibid, p. 166.

تاگووردا لە کەمبریج وتی: «ئێستا دەتوانم مەسیحی میهرەبان و هەروەها توانایی و هێز ببینم.»[٤٨]

لە پاشکۆی تایمزی ئەدەبیدا، شیعرەکانی تاگوور بەم شێوەیە ستایش کران: «چەندی زیاتر لە خوێندنەوەی شیعرەکانی تاگوور بچینە پێشەوە، زیاتر هەست دەکەین کە خوێنەری زەبووری ئەم سەردەمەین و ئەو خوایەی ڕووی لەو کردووە بە هۆی ئیمان و ئەزموونی تاکەکەسیی شاعیرەوە هاتۆتەدی.» بەم شێوەیە هەمووو لایەك قوولایی فەلسەفی و مۆسیقایی گیتانجالییان ستایش کرد. دوای ئەمە ناوی تاگوور، مامۆستای مەعنەویات، کە بە پەیامی ئاشتی و ئومێدەوە لە هیندستانەوە هاتووە لە جاران زیاتر کەوتە سەر زاران. سنوورەکان بە ڕوویدا کرانەوە. لە هەموو لایەکی دنیاوە میوانداریییان دەکرد تاوەکو باسی تێڕامانە فەلسەفییەکانی خۆی بکات. وتارەکانی ئەو لە شوباتی ١٩١٣ لە زانکۆی هارڤاردو دواتر بە پێداچوونەوە و پوختکردنەوە بە ناوی *چەسپانی ناکۆتا* وەك کتێبێك بلاوکرایەوە. شەوێك لە ناو کۆمەڵێك لە بیسەرانی فەیلەسووفی بەناوبانگی ئینگلیزی بەرتراند ڕاسڵ ئامادە بوو کە سالانێك دوای ئەوە لە باسی تاگووردا وتی: «لەڕووی سووککردنی باری دەمارگیرییەکان و نەهێشتنی هزرە درۆیینەکانی ئەورووپا و ئەمریکا، تاگوور شایستەی گەورەترین

48- Ibid, p. 167.



ڕێزگرتنە»[٤٩]. هەروەها یەکێك لە دیارترین ڕوخسارە فەلسەفییەکانی سەدەی ئێستا، لودڤیك ڤیتگنشتاین شەیدای شیعرەکانی تاگوور بوو و زۆربەیانی دەخوێندنەوە و نەقڵی دەکرد. سەرنجڕاکێشتر ئەوەیە کە بەناوبانگە دەڵێن لە مشتومڕ لەگەڵ پۆزیتیڤیستە لۆژیکییەکاندا هەندێ جار ڕووی وەردەگێڕا و پشتی لە ئامادەبووانی کۆبوونەوە دەکرد و چەند بەشێکی *گیتانجالی* بە دەنگی بەرزەوە دەخوێندەوە.

بێگومان لەو سەردەمەدا ڕابیندرانات تاگوور لە ڕۆژئاوادا پێشوازییەکی گەرمتری لێ دەکرا وەك لە نیشتمانی خۆی واتە هیندستان. هەڵبەت کاردانەوەی هیندییەکانیش وەك یەك نەبوو. هەندێ کەس هۆنراوەکانی ئەویان بە لاساییکردنەوەی شاعیرانی ڤیشنویی دەزانی. کۆمەڵێکیش گومانیان دەکرد کە تاگوور ببێتە پالێوراوی خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی. یەکەمین ژیاننامەنووسی تاگوور، باسەنتا کومار ڕۆی[٥٠]، لە ساڵی ١٩١٣ پێشبینی دەکرد کە درەنگ یا زوو تاگوور خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی بەدەست دەهێنێت؛ و تاگوور کە وەك دیاربوو لەم پێشبینییە سەری سوڕما بوو وەڵامی ئەوی دایەوە: «باوەڕ دەکەی ئاسیاییەکان بۆ وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵ قبووڵ بکەن؟ »[٥١]. لە ڕاستیدا تاگوور لە دەربڕینی ئەم گومانەی سەبارەت بە وەدەستهێنانی ئەم خەڵاتە بەهەڵەدا نەچووبوو. چونکە هەر کە ناوی تاگوور وەك

49- Ibid, p.178.

50- Basanta Kumar Roy

51- Krishna Kripalani, Tagore: A life, New Delhi, 1971, p. 129.

براوەی خەڵاتی نۆبڵ لە ١٤ی تشرینی دووەمی ١٩١٣ ڕاگەیەندرا، بڵاوکراوە ئەمریکایی و کەنەداییەکان ئاڵای ناڕەزاییان لەو دەستنیشانکردنەدا بەرزکردەوە. بڵاوکراوەی *گڵۆب*[٥٢] چاپی تۆرنتۆ لە سەروتارەکەیدا نووسیی: «یەکەمین جارە کە یەکێکی غەیرە سپی پێست خەڵاتی نۆبڵ بەدەست دەهێنێت». لۆس ئەنجلز تایمز[٥٣] بە ئاوازێکی ڕەقتر و توندتر ناڕەزایی دەربڕی کە: «هەواڵی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵی ئەم ساڵ بە شاعیرێکی هیندی کە بەگران دەتوانرێت ناوەکەشی گۆ (تلفظ) بکرێت لاوانی ئەوروپایی و ئەمریکایی نائومێد کردووە.»[٥٤]

تاگوور هەموو ئەو ڕەخنانەی پشتگوێ دەخست. ماوەکی کەم لە پێش ڕاگەیاندنی ناوی براوەی خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی، ئەوروپای بەجێ هێشت و گەڕایەوە بۆ زێدی خۆی. لە شانتی نیکتان بوو کە هەواڵی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵی بیست. لەگەڵ ئەوەی بەو سەربەرزییە چاوەڕوان نەکراوە دڵخۆش بوو، بەڵام لەو هێرشە بانگهێشت نەکراوەی کە هاوڕێکانی و ستایشکەرانی دەیانکردە سەری و ئارامی و خەڵوەتیان لێ بری بێزار ببوو. لە نامەیەکدا لە ڕێکەوتی ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩١٣ بۆ ڕۆتنشتین نووسی کە ڕۆژەکان بەبێ کار بەسەر دەبات و «بێ سەبرانە لە چاوەڕوانی ڕۆژێك دام کە ئەم ژاوە ژاوە دامرکێتەوە و بەسەر چێت و

52- Globe
53- Los Angeles Times
54- Ibid, p. 129.



مرۆڤەکان بەئارامی بگەن و هەقیقەت تیشك بهاوێت کە داوەریی (حکوومدانی) ڕۆژئاوا ناڕەوا نییە.»[٥٥]

با سەرنجی ئەم خاڵەش بدەین کە سەرکەوتنی جیهانیی تاگوور بە گشتی لە لایەن سیاسەتمەدارانی هیندیی ئەو سەردەمەوە بایەخی پێنەدرا. مەهاتما گاندی کە لەو کاتەدا لە ئەفریقای باشوور دەژیا لەو کەسایەتیانە بوو کە ستایشی تاگووری کرد. لەو ڕۆژگارەدا تاگوور و گاندی تەنیا بەناو یەکتریان دەناسی. یەکەمین دیدار لەنێوان ئەم دووانەدا دوای گەڕانەوەی گاندی بوو بۆ هیندستان لە ئازاری ١٩١٥. یەکێك لە یەکەمین کارە دیارە سمبۆلییەکانی گاندی لەدوای گەڕانەوەی بۆ نیشتمان سەردانێك بوو بۆ شانتی نیکتان. ماوەیەکی کەم لە پێش ئەم سەردانەیدا، گاندی داوای لە هاوڕێی هاوبەشیان، واتە چارلز ئەندرۆز کردبوو کە ئەرکێك لە ئەستۆ بگرێت و جێگەی بیست کوڕە منداڵ لە ئۆردوگای فیۆنکس[٥٦] بە ڕەزامەندی تاگوور لە شانتی نیکتان بکاتەوە. پاشان خودی گاندیش بۆ ئەوێ سەفەری کرد و بۆ ماوەی شەش ڕۆژ لە ئەشرام لەگەڵ تاگووردا کاتیان بەسەربرد. بەڕای گاندی بارودۆخی قوتابییەکان زۆر سەربژاردەییانە بوو. پێشنیاری کرد بەهەر ڕێگەیەك بێت قوتابییەکان وا لێبکەن کە خۆیان کارە تایبەتییەکانیان

55- Rabindranath Tagore (The Myriad-Minded Man), p. 182.
56- Pheonix

ئەنجام بدەن. لەو ڕۆژەوە هەموو ساڵێك بە یادی مەهاتما گاندییەوە ڕێوڕەسمێك لەو مێژووەدا لە شانتی نیكتان ئەنجام دەدرێت.

گاندی و تاگوور لەگەڵ بوونی هەندێ جیاوازی لە مەسەلە جۆربەجۆرەكاندا بەچاوی ڕێزەوە سەیری یەكتریان دەكرد. هەردووكیان كاریگەریی مەعنەوییەتی هیند و هزری ڕۆژئاوایان لەسەر بوو ـ بەڵام لە مەسەلە سیاسی و ئایینییەكاندا هاو بۆچوون نەبوون. یەكێك لە خاڵە جیاوازەكانی ئەو دووانە لەسەر كەسایەتی راموهان ڕۆی بوو. تاگوور، وەك مورشیدێك یان ڕێبەرێك سەیری ڕۆی دەكرد، لەكاتێكدا بەڕای گاندی ئەو نوێخوازێكی بێ لوتف بوو. تاگوور لە وتارێكدا لە ئەیلوولی ١٩٢٥ ئەمەی ڕوون كردۆتەوە: «یەكێك لە جیاوازییەكانمان لەڕووی بیرو بۆچوون و سروشتەوە ئەوەیە مەهاتما گاندی راموهان ڕۆی وەك كورتە باڵایەك دەبینێت و من بە پیاوێكی گەورەی دەزانم و ڕێزی لێدەگرم»[٥٧].

گاندی كە بەئاشكرا لە ڕەخنەكانی تاگوور حەپەسابوو بە دەنگێكی لەسەرخۆ بەڵام بەتەوسەوە وەڵامی شاعیری دایەوە: ئاشكرایە كە تاگوور لە بورجە عاجەكەیەوە ناتوانێت ڕاستییە سیاسییەكانی هیند بە دروستی ببینێت. «ئەگەر شاعیری ئێمە كەمێك زەحمەت بكێشێت و لە ڕۆژێكدا نیو كاتژمێر قوماش بچنێت، شیعرەكەی ئاوازێكی

57- Ibid, p.262.



خۆشتری دەبێت، چونكە ئەگەر وابكات بە پابەندی و توانایەكی چەند بەرامبەرەوە ڕەنجی نەداران پیشان دەدات.»[٥٨]

لەگەڵ ئەوەشدا گاندی نەیدەتوانی چاو لەوە بپۆشێت كە تاگوور كە نیشانی جوامێری شوالیەی پێبەخشرابوو، بۆ ناڕەزایی دەربڕین لەبەرامبەر كوشتاری ئەمریتسار[٥٩] كە لە ئازاری ١٩١٩ ڕوویدا بۆ حكوومەتی بەریتانیای گەڕاندەوە. تاگوور كە ئاگاداری ئەو جیاوازییە گەورەیەی نێوان خۆی و گاندی بوو، لە نامەیەكدا بۆ ڕۆمن ڕۆلانی نووسی: «هیواداربووم بتوانم پەیوەندی بە مەهاتما گاندییەوە بكەم و خۆم بخەمە پاڵ ریزی پشتگیری جەماوەرییەوە. بەڵام چیتر ناتوانم ئەو لایەنە گرنگە لەخۆمدا بشارمەوە كە سەرەڕای ئەوەی هەردووكمان لە گەڕان بەدوای هەقیقەت و گوزارش لێكردنی، لە بنج و بناوانەوە جیاوازین، بەڵام چیتر ئەمڕۆ ناتوانین نەیاری مەهاتما بین و ئاسوودە بژین. بۆیە لێی دوور دەكەومەوە...»[٦٠]

تاگوور لە ١٩٢٤ دا سەفەری بۆ چین و ژاپۆن كرد. پاشان خۆی ئامادەكرد كە بچێتە سەفەرێك بۆ ئەمریكای باشوور و ئیتاڵیای فاشیزم. سەرەڕای ئەوەی كە لەگەڵ فاشیزمدا ناتەبابوو و وەكو فەندەمێنتالیزم(الاصولیە)ی هیندیی و كوكلوس كلان ڕەخنەی لێ

58- Ibid, p.263.
59- Amritsar
60- Ibid, p.265.

دەگرت، بەڵام لە خەونی چەسپاندنی زانکۆی جیهانیدا، بانگهێشتی مۆسۆلینی بۆ سەردانی ئیتاڵیای قبووڵ کرد. ئەم دووانە لە ٣١ی ئایاری ١٩٢٦ لە ڕۆما چاویان بە یەکتری کەوت و مۆسۆلینی لەبەرچاوی خەڵکدا بانگەشەی ئەوەیکرد کە تەواوی بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانی تاگووری بە زمانی ئیتاڵی خوێندۆتەوە. تاگوور لە گفتوگۆیەکیدا لەگەڵ بڵاوکراوەی تریبۆنا[٦١]ی فاشیستیدا ڕایگەیاند: «عالیجەناب مۆسۆلینی وەك بلێی ڕۆح و جەستەی مۆدیلێکە کە بە مووکێشەکەی مایکل ئانژییە نووساوە...»[٦٢] سەفەرەکەی تاگوور بۆ ئیتاڵیا ژمارەیەکی زۆر لە هاوڕێ و دۆستانی ئەورووپایی ئەویان زۆر نارەحەت کرد. تا لەکۆتایی سەفەرەکەیدا کاتێ کە بە وڵاتی سویسرادا تێپەڕی، ڕۆمن ڕۆلان کە تاگووری باش دەناسی و لە ئازایەتی و جوامێری ئەو پیاوەدا هیچ گومانی نەبوو، وایکرد تاگوور چاوی بە دوورخراوەکانی ئیتاڵیای فاشیست بکەوێت و زیاتر لە ڕووداو و بارودۆخی ئیتاڵیا ئاگادار بێت. ئەم دیدارە ئەنجام و بەرهەمی هەبوو، و تاگوور دوای ئەو دیدارەی نامەیەکی دوور و درێژی بۆ چارلز ئەندرۆز نووسی و ڕای تازەی خۆی ڕاشکاوانە دەربڕی. بڵاوبوونەوەی ئەو نامەیە لە بڵاوکراوەی *مانچستەر گاردیان*[٦٣] لە ٥ی ئابی ١٩٢٥، بووە مایەی تووڕەیی و نەفرەتی هەموو بڵاوکراوەکانی ئیتاڵیا و تاگووریان دایە بەر

61- Tribuna

62- Ibid, p.267.

63- Manchester Guardian



قسەی ناشرین و بە تارتوفی[٦٤] ساختەچی ناوزەدیان کرد کە پارێزگاری لە دوژمنانی فاشیزم دەکات. بەهەر حاڵ سەفەرەکەی بۆ ئیتاڵیا کاتیی بوو، و زیانی بەناوبانگی تاگوور لە ڕۆژئاوادا نەگەیاند. تاگوور درێژەی بە سەفەرەکەی خۆیدا بۆ ئوستورالیا، سوید، دانیمارك، ئەڵمانیا، ڕۆمانیا، یۆنان، میسر، ئینگلتەرا. لەگەڵ سەردانەکەی بۆ عێراق و ئێران لە ١٩٣٢دا سەفەرە دوور و درێژەکانی تاگوور بەکامڵ بوون. تاگوور لە ئێران چاوی بە کۆمەڵێك لە ڕۆشنبیران کەوت و مەزارگەی سەعدی و حافزی بەسەرکردەوە.

پاش گەڕانەوەی بۆ هیند، تاگوور هەشتساڵی بۆ پەروەردە و فێرکردنی پەرەسەندنی مەعنەویات لە جیهاندا تەرخانکرد. لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا سەرلەنوێ ڕووی کردە وێنەکێشان و لە ماوەی دەساڵدا دوو هەزار بەرهەمی وێنەکێشانی ئافراند. لە ساڵی ١٩٣٠ لەسەر بانگهێشتی دۆستێکی بەناوی ڤیکتۆریا ئۆکەمپۆ[٦٥] کە خەڵکی ئەمریکای باشوور بوو، و بەڕێوەبەری نووسینی بڵاوکراوەی *سوور*[٦٦] بوو، پێشانگایەکی لە پاریس کردەوە. تاگوور کە بە سەرکەوتنی پێشەنگاکەی پاریس و پێشوازیی ڕۆژئاواییەکان لە تابلۆکانی دڵگەرم ببوو، بانگهێشتی زانکۆی ئوکسفۆردی پەسەندکرد بۆ پێشکەشکردنی چەند وتارێك بەناوی "ئایینیی مرۆڤ". هزری تەوەرەیی ئەم وتارانە

dd' Tartuff کەسایەتی دوو ڕوو و خراپەکاری شانۆنامەی "تارتۆفی" مولیێر.

65- Victoria O'Campo

66- Sur

خواوەندێتی مرۆڤ بوو کە لە هەمانساڵدا بووە بابەتی گفتوگۆی ئەنشتاین و تاگوور.

چەند مانگێك لەدوای دیدارەکەی لەگەڵ ئەنشتاین دا، تاگوور لەگەڵ مارگوت ئەنشتاین و هاورێکەی دیمیتری ماریانۆف[٦٧] سەفەری بۆ مۆسکۆ کرد. هەوڵەکانی سۆڤیەت بۆ پلانی فێرکاری بەشێوەیەك کاریگەری لەسەر تاگوور بەجێ هێشت کە لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ بڵاوکراوەی ئیزڤیستیا[٦٨]، ڕاپۆرتێکی ئیجابی و تێروتەسەلی لەسەر سەفەرەکەی سۆڤیەت پێشکەش کرد. لەگەڵ ئەوەشدا دلێری و ئازایەتی نواند و لە هەمان گفتوگۆدا ڕەخنەی لە ڕەفتاری توندوتیژانەی دەوڵەتی سۆڤیەت گرت و باسی پێویستی ئازادیی هزر و بیری کرد: «ئازادی هزر و بیر بۆ گەشەکردنی هەقیقەت زۆر پێویستە و نەبوونی ئازادی بکوژیەتی ... لەبەر خۆشەویستیم بۆ مرۆڤایەتی هیوادارم ئێوە پەنا نەبەنە بەر هێزی بێ بەزەیی توندوتیژیی و ستەم...»[٦٩] ئەم گفتوگۆیەی تاگوور لەگەڵ ئیزڤیستیا تا ساڵی ١٩٨٨، نزیکەی پەنجا ساڵ دوای مردنی شاعیر بڵاو نەکرایەوە. لەبەر ئەم قسانە تاگوور جارێکیتر کەوتەوە بەر هێرش و ڕووسەکانی دانیشتووی ئەمریکا پەنجەی نارەزاییان بۆ درێژ دەکرد. سێرگی رەخمانۆف[٧٠] و ئیلیا تۆڵستۆی[٧١] و

67- Dimitri Marianoff

68- Izvestia

69- Ibid, p. 197.

70- Sergei Rachmaninov



چەند کەسێکی تر لەناودارانی ڕووسیا لە مەنفا لە نامەیەکی کراوەدا بۆ بڵاوکراوەی نیویۆرك تایمز ڕەخنەی توندیان لێگرت کە بۆچی پشتگیریی لە «کۆمەڵێك تاوانباری پیشەیی» کردووە. بەڵام ئەو کەسانەی کە تاگووریان دەناسی، باش دەیانزانی کە هیچ یەکێك لە سەفەرەکانی ئەو بەنیازی هەڵوێستە سیاسییەکان نەبووە و لە خەیاڵە میتافیزیکی و عیرفانییەکانی شاعیرەوە هەڵقوڵاون و لە خزمەتی ئامانجە باڵاکانی تری وەك گفتوگۆی شارستانیەتەکان و مرۆڤگەرایی جیهانیدا بوونە. تەماشایەکی خێرا بە سەردێری نووسینە جۆربەجۆرەکانی تاگوور و هزری فێرکاری ئەو شایەتن بۆ ئەم کارە. ئامانجی تاگوور لە سەفەرەکانی و دیداری لەگەڵ کەسایەتییە جیاوازەکان زیاتر لە هەموو شتێك بەهێزکردنی لایەنی پەروەردە و فێرکردن بوو کە تاوەکو ١٧ی ئابی ١٩٤١، ڕۆژی مردنی لەگەڵی دابوو. تاگوور یەك ساڵ بەر لە مردنی چاودێری و سەرپەرشتیکردنی دایمی شانتی نیکتانی بە گاندی سپارد. گاندی کە خۆی لە بواری فێرکردندا چاکسازێکی لێهاتوو بوو بەرەو ئەو کارە نوێیە هەنگاوی نا و دڵسۆزی خۆی بۆ ئەم دامەزراوە نوێیە دەربڕی: «لەگەڵ ئەوەی هەمیشە شانتی نیکتانم بە ماڵی دووەمی خۆم زانیوە، ئەم جارە

71- Ilya Tolstoi

(دوایەمین دیدار لە کانوونی دووەمی ١٩٤٠) زیاتر لە جاران دڵم گیرۆدەی ئەم مەڵبەندە بووە.))[٧٢]

دوای چەند مانگێك تاگوور دکتۆرای فەخریی زانکۆی ئۆکسفۆردی وەرگرت و لەکاتێکدا بەخەستی نەخۆش کەوتبوو سێر موریس گوییر[٧٣] نازناوی فەخریی قازی گەورەی هیندی پێ بەخشی. تاگوور لەسەر قەرەوێڵەی نەخۆشیش بەهەمان شێوەی جاران شاعیر بوو و دەستی لەهۆنینەوەی شیعر بەرنەدا. ئەو شیعرانە لەدوای مردنی بە ناوی *دوایین نووسراو*[٧٤] بڵاو بوونەوە.

تاگوور لە ١٤ی مانگی ئایاری ١٩٤١، بەبۆنەی ساڵی نوێی بەنگاڵییەوە دوایەمین پەیامی خۆی بەناوی قەیرانی شارستانییەتەکان بەزمانی بەنگاڵی لەبەردەم خەڵکدا خوێندەوە. ئەم قسانە دەنگی زوڵاڵی زانایەکی هەشتا ساڵە بوو کە متمانەی خۆی بە مرۆڤی دووچار بوو بە مەترسی دەردەبڕی: ((چەند لەم ئاسۆیەوە، لە ڕۆژهەڵاتەوە کە ڕۆژ سەر دەردێنێت، زەردەپەڕێکی نوێ دەردەکەوێت! کەواتە مرۆڤی تەواو دۆڕاو، سەرەڕای بوونی هەموو ڕێگرەکان، دووبارە ڕێگەیەك

72- Ibid, p. 323.
73- Ser Maurice Gwyer
74- Sesh Lekha



دەگرێتەبەر تاوەکو جارێکیتر میراتە (کەلەپوورە) ونبووەکەی بەدەست بهێنێتەوە.))[٧٥]

دوای پەنجا ساڵ، نووسەرێکی تری بەڕەچەڵەك هیندی بەناوی ڤی. ئێس. نایپاڵ[٧٦] بۆ ئەم وتەی تاگوور دەگەڕێتەوە و دەڵێت: ((ئەو قسانە، خواحافیزییەکی خەمناکی پیرەمێردێك بوو لەم دنیایەدا. دوای پێنج ساڵ شەڕ کۆتایی هات. ئەوروپا لەهەوڵی چارەسەرکردنی خۆیدا بوو. لە نیوەی دووەمی سەدەکەدا، هێز و داهێنان و نفوزی ڕۆژئاوا دیسان زیادی کرد، کارەساتێ کە تاگوور نەیبینی بەسەر کلکەتەدا هات.))[٧٧]

لە ٧ی ئابی ١٩٤١، رابیندرانات تاگوور لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا لەماڵەکەی خۆی کۆچی دوایی کرد. جەواهیر لەعل نەهرۆ، کە لەوکاتەدا لەزینداندا بوو لە دەفتەری یادگاری خۆیدا نووسی: ((رێبەری روحانی= گورودێڤ[٧٨]، کۆچی دوایی کرد. چەرخێك کۆتایی پێهات.))[٧٩] بەم شێوەیە رابیندرانات تاگوور چووە ناو پانتیۆنی کەسایەتییە گەورەکانی ئەم سەردەمەوە. ناوی ئەو لەگەڵ گفتوگۆی شارستانییەتییەکاندا ئاوێتە بووە.

75- Rabindranath Tagore, Vers I home Universal, Gallimard, 1964, p. 330.
76- V. S. Naipaul
77- Ibid, p. 365.
78- Gurudev
79- Ibid, p. 368.

## بەشی دووەم

### گەڕان بەدوای ناکۆتا

**هەموو شتێك لە نەمرییەوە سەرچاوە دەگرێت و دەکەوێتە ژێر کاریگەری ژیانەوە، چونکە ژیان زۆر گەورەیە.**

### رابیندرانات تاگوور

رابیندرانات تاگوور بەمانای باوی وشە فەیلەسووف نییە. بەڵام دەتوانین بڵێین چاوکراوە و ئاگادارە (زانایە) و تێگەیشتنێکی قووڵی هەیە بۆ ژیان و ئەو شتەی بە «هەقیقەت»ی دەزانێت. تاگوور عارفانە هەوڵ دەدات ئەم «هەقیقەتە» لە ژیاندا بەرجەستە بکات. لەم ڕووەوە ئەزموونە شیعری- ئایینیی و هەروەها کۆمەڵایەتی — فێرکارییەکانی تاگوور هەمووی بەرهەمی ئەو بەدوادا وێڵبوونەن. وەك خۆی دەڵێت: «دەتوانین هەقیقەت بەهی کەسێتی لە قەڵەم بدەین کە لە دەرکەوتە یەك لەدوای یەکەکاندا کاریگەری لەسەر کەسایەتییەکان بەجێ



دەهێڵێت.»[80] تاگوور هەقیقەت بە بەشێکی دوورەدەست و دەرك نەکراو نازانێت، بەڵکو پێی وایە لە زۆر زووەوە چالاکە و کاریگەری لەسەر کەسێتی ئێمە دادەنێت. هەقیقەت مەسەلەیەکی تاکەکەسییە، قەرار نییە خۆمانی بەدەستەوە بدەین، بەڵکو چەسپاندنی جێی مەبەستە. لەبەر ئەوە تاگوور زۆر جار باسی ئەزموونی هەقیقەت دەکات و ناوی دەنێت: «نیشانەی ناکۆتا». هەرکاتێك قسە لەسەر *کەسایەتی باڵا* دەکات مەبەستی هەقیقەتە کە خوایە، هەندێ جاریش ناوی دەنێت سروشتی گەورە. لەم دوو چەمکەی تاگوورەوە دەبێت جۆری سێیەمی بۆ زیاد بکرێت کە «خود» یان تاکێکی کۆتایی پێکهاتووە. بەم شێوەیە لە هزری تاگووردا، خوا، سروشت، خود دەرکەوتەی سێ ڕووی هەقیقەتێکن. ئەم سیانە دەرکەوتەی کەسێکن. چونکە بەبۆچوونی ئەو ئەگەر جیهان ڕەنگدانەوەی تاکەکەسیك نەبێت، فێڵێکی ترسناکە.»[81] جیهان بە ئەندازەی «هەقیقەت» واقعییە، چونکە ڕەنگدانەوەی ئەوە. بۆیە دیارە کە مایا[82]- واتە خەیاڵپلاوی(توهم)- لە بۆچوونی تاگووردا بۆ جیهان شوێنێکی ئەوتۆی نییە، چونکە جیهان بە ئەندازەی خوا واقعییە و بە ئەندازەی مرۆڤ

80- Rabindranath Tagore: Creative Unity, Macmillan, Madras, 1988, p. 35.

83 Rabindranath Tagore, Personality, p. 71.

82- Maya

تاکەکەسییە و سەرچاوەی مرۆڤ و گەردوونە. هەقیقەتی کۆتایی خوایە کە تەنیا لە ڕێی ئەزموونی عیرفانییەوە دەتوانرێت دەرکی پێ بکرێت. چونکە ئیشراق عیرفانیانە بەرەو ناخی هەقیقەت ڕێنماییمان دەکات و بەکارهێنانی عەقڵ تیایدا بێ توانایە. ئەوەی لە ڕوانگەی تاگوورەوە گرنگە ئەوەیە کە لە قووڵایی ناخمانەوە هەست بە نیشانە ناکۆتاکان بکەین بەبێ ئەوەی بە شێوەیەکی لۆجیکی و عەقڵانی بە دوای ناسینیاندا بگەڕێین. لەم حاڵەتەدا تامەزرۆیی دەروونیی بە شێوەی *شادی* دەردەکەون کە لە هەناوی هەقیقەتی کۆتاییدا جێگیر بووە. بەواتایەکی تر بە دەروونی کردنی ناکۆتا لە مرۆڤدا بەدیهێنەری شادییەکە کە لە ڕێی عەشقەوە جێبەجێ دەکرێ. تاگوور پێمان دەڵێ تاکە ڕێگەی خواناسی یان ناکۆتا تەنیا عەشقە و بەس. ئەگەر خوا عەشق بێت، ڕێگەی گەیشتن بە خوا جگە لە عەشق هیچی تر نییە.

هەروەها جەخت دەکاتەوە کە: «هەرکاتێك مرۆڤێك لە ڕۆحیدا ترپەی ژیان و ڕۆحی گەورەی گەردوون هەست پێ بکات، بە ئازادی گەیشتووە .... لەو کاتەدا لە دەنگ و ئاوازی ئەو پێغەمبەرە قارەمانە تێدەگات کە دەڵێ: «دنیا لە عەشقەوە لەدایکبوو، لەگەڵ عەشقیشدا ڕاوەستا، بەرەو عەشقێکیش دەڕوات کە هەموو ناکۆکییەکانی بوون لەناو دەچن. تەنیا لە عەشقدا یەك و دوو لە تەك یەك دان. تەنیا لە عەشقدا جوولە و وەستان پێکەوەن .... بردنەوە و دوڕان یەکێکن. لە عەشق دایە کە



بەندایەتی و ئازادی دژیەك نین، چونکە عەشق دوا پلەی ئازادییە و دوا پلەی بەندایەتییە. ڕازی ئەم سنووردارییەتییە ئەو بوونەوەرە ناکۆتایە لە ئەستۆی گرتووە، و لەئەودا کە عەشق هەیە کۆتا و ناکۆتا یەکێکن.»[٨٣]

کەوا بوو لای تاگوور عەشق ئەزموونێکە کە عاشق بە بابەتی عەشقەوە دەبەستێتەوە. هەر لەبەر ئەوەش لە بواری عەشقدا وا نابینێت دژایەتی لە نێوان یەکبوون و دوالیزمدا هەبێت. چونکە عەشقیش دوالیزمی کۆتا و ناکۆتایە و هەم ئەو بنەمایەیە کە یەکێتی بەو دووانە دەبەخشێت. بەڵام تاگوور بە دڵنیاییەوە دەڵێت ئەو عەشقە خاڵییە لە هەموو وابەستەییەك. بە پێچەوانەوەی وابەستە بوون، ناوکی کردەی عەشق خاڵییە لە خۆپەرستی. چونکە مەعشوق خۆی ڕزگار دەکات تاوەکو عەشق بدۆزێتەوە. کەواتە وادادەنرێت عەشق فیداکاریی لە مەعشوق داوا دەکات، و بۆ ویستنی یەکێکی تر دەبێت جۆش و خرۆشە خۆپەسندەکان بکرێن بە قوربانی. تاگوور لە ڕوونکردنەوەی ئەو مەسەلەیەدا نموونەی نەوت و چرا دێنێتەوە: «چرا نەوتەکەی لەناو خۆیدا دێڵێتەوە و ئاگادارییەتی کە بەفیڕۆ نەڕوات، و خۆشی بە تەواوی گۆشەگیر دەکات و خۆی لە هەموو شتێکی دەوروبەری بە تەواوی دادەبڕێت ... قرچۆك و ڕەزیلە بەڵام هەر کە چراکە دادەگیرسێنین ڕۆڵی

83- Rabindranath Tagore, Sadhana, Albin Michel, 1940, p. 117-118.

خۆی دەبینێتەوە. سەر لەنوێ پەیوەندی لەگەڵ شتەکانی دەوروبەریدا دروست دەکات. سەخاوەتمەندانە پاشەکەوتی نەوتەکەی وەك خۆراك بۆ گڕەکەی قوربانی دەکات. «من»ی ئێمە وەك ئەو چرایە وایە. تا ئەو کاتەی ماڵ و سامان کۆدەکاتەوە لە تاریکیدا دەمێنێتەوە. کاتێك بە (ئیشراق) گەیشت گڕەکەی بڵێسە دەسێنێت و هەرچی هەیەتی دەیکاتە قوربانیی ئەو، چونکە خۆی بەدیار دەخات.»[٨٤]

عەشق هیچ جۆرێك لە نەبوونی و بێ بەشی نییە، بەپێچەوانەوە عەشق لەبەرامبەر عەشقەکەیدا داوای کردە (عمل) لە مەعشوق دەکات. عەشق بە چاکەکردن لەگەڵ ئەوانی تردا پێشکەش دەکرێت. تاگوور دەڵێ: «رۆحی چاکەکاری وامان لێدەکات کە لە پێویستیی (svartha) ئەویتردا، پێویستیی منی تایبەتی (nihilartha) خۆم ببینم، ئەوەش دەریدەخات کە تەرخانکردنی توانا جۆربەجۆرەکان لە مەسەلە زۆر گرینگەکەی مرۆڤایەتیدا هەمان شادی و کامەرانی ئێمەیە.»[٨٥] کەواتە مرۆڤ تەنیا بە ڕەوشت و ڕەفتاری دوور لە ڕق و کینە و نیەتی خراپ بەرامبەر بە ئەوانیتر دەتوانێت خۆی بناسێت و بە ئاقاری دەوڵەمەندی و ئازادی و شادمانی بگات. بە کورتی، رۆحێك کە هەموو کارێك بۆ برەهمەن تەرخان بکات بەشادی دەگات. کاری شاعیریش لە ئەفراندنی

84- Ibid, p. 80.
85- Ibid, p.135.



شاعیرانەیدا شادومانییە. چونکە هەر کەسێ بتوانێت یەکبوونێك لە نێوان رۆحی خۆی و هەقیقەتی گەردوونی بدۆزێتەوە ئەوا شادومانیی ناکۆتای بەدەستهێناوە. وەك تاگوور دەڵێ: «کامەرانیی ژیان، کامەرانیی کارکردن لە مرۆڤدا تەواو ڕاستە. ئەگەر بڵێین ئەمە هەمووی خەیاڵپڵاوییە بەکەڵکی هیچ نایەت، و تاوەکو ئەم قسانە فڕێ نەدەین بەرەو چەسپاندنی خودی خۆمان هەنگاو نانێین. گەڕان بە دوای چەسپاندنی ناکۆتا لە دەرەوەی بازنەی پراکتیکدا نامانگەیەنێتە هیچ شوێنێك و سوودیشی نییە.»[٨٦]

جەختکردنەوەی تاگوور لەسەر تاکێتی مرۆڤ لەبەر ئەم هۆیەوەیە، کە مرۆڤ تاکە بوونەوەرێکە کە لە ڕێگەی ناسینی خوادا دەبێت لە هیچ کۆششێك درێغی نەکات. تاگوور ئەم کۆششەی ناودەنێت جۆرێك لە تاقیکردنەوەی ئازادی. ناتوانین تەنیا بە شێوازێکی عەقڵانی بە ناکۆتا بگەین، مەگەر ئەوەی پەیوەندی جۆراوجۆر لەگەڵ گەردووندا کە دروستکراوی خوایە ببەستین.

ژیان پرۆسەی گۆڕان و چەسپاندنی خودە: «گەیشتن بە کەماڵ و خۆ چەسپاندن لەم ڕێڕەوەدایە کە مرۆڤ هەموو هێز و تواناکانی خۆی بۆ بخاتە گەڕ... هەر کە رۆحی مرۆڤ لە «بوون»ی ناکۆتادا بچەسپێ،

86- Ibid, p.124.

هەنگاو دەنێت بەرەو پلەی مرۆڤی کامڵ و تەواو و دەپشکوێت...»[87] ڕاستە مرۆڤ بە چوونە پاڵ ناکۆتاوە هەقیقەت بەدەست دێنێت، بەڵام ناکۆتا بەهیچ شێوەیەك لە دەرەوەی خودی مرۆڤەوە نییە. چونکە خودی مرۆڤ بوونێکی کۆتا-ناکۆتایە. مرۆڤ لە پلەی بوونەوەری کۆتادا بەستراوەتەوە بە سروشتەوە، و لە پلەی بوونەوەری ناکۆتادا میری جیهانە و فەرمانڕەوایی دەکات. کەواتە وەك چۆن مرۆڤ کاریگەری لەسەر گەردوون هەیە ئاوا ناکۆتا لە مرۆڤدا و لە ڕێگەی مرۆڤەوە کاریگەری لەسەر گەردوون هەیە، چونکە یەزدان یان ناکۆتا هەمان ئایدیاڵی کۆتایی کەماڵە و مرۆڤیش پرۆسەی نەمری چەسپاندنی ئەو ئایدیاڵەیە. بە گوتەی تاگوور: «ئەمەیە تاکە ئامانجی مرۆڤ: دۆزینەوەی یەکتایی کە لەودایە، کە هەقیقەتی ئەوە، کلیلی ڕۆحی بەرزی ئەوە کە هەموو دەرگاکانی ژیانی ڕۆحانی لە پانتایی ئاسماندا دەکاتەوە. مرۆڤ گرفتاری ئارەزووی جۆراوجۆرە و ئەم ئارەزووە پەرت و بڵاوانە بەدوای ئامانجە جیاوازەکاندا بە جیهاندا دەگەڕێن چونکە بوون و دەرەنجامیان جگە لەوە نییە. بەڵام ئەو شتەی کە هەمیشە لە مرۆڤدا یەکتایە هەر ئەو گەڕانەیە بەدوای یەکێتیدا- یەکێتی لە مەعریفەدا- یەکێتی لە عەشقدا- یەکێتی لە ئامانجەکاندا، و بەدەستهێنانی

87- Ibid, p. 47.



شادمانیی باڵا لە سەرکەوتن بە چوونە پاڵ ناکۆتای یەکتاوە، لە ناخی یەکێتیی نەمر و هەتاهەتاییدا.»[88]

لە هزی تاگووردا، مرۆڤ خاوەنی دوو جەوهەرە: یەکێکیان جەستەی سروشتییە بە پێویستی جەستەیی و فسیۆلۆژییەکانەوە، ئەویتریان رووحێکی ئەوەندە بەتوانایە کە بەرزایەتی بە پێویستییەکان دەبەخشێ و ئازادیی داهێنەرانەی ئەو وەگەڕ دەخات. مرۆڤ کاریگەری لەسەر سروشت بەجێ دەهێڵێت و هونەر و جوانی دەئافرێنێ. بەڵام لە ئافراندندا وەها هۆشیارییەك دەنوێنێ کە دەتوانێ قەفەزە سنووردارەکان بشکێنێ و خۆی بە بەرزایەتی بگەیەنێت. کەواتە هونەر نمایشی شتەکان نییە. دۆزینەوەی مرۆڤ خۆیەتی: «لە هونەردا ئەو کەسەی لە ناخی ئێمەدایە وەڵامی ئەو کەسە باڵایە دەداتەوە کە لەو دیو دنیای لێڵی واقیعەکانەوە، خۆی لە دنیای ئێستاتیکایی ناکۆتادا بۆ ئێمە ئاشکرا دەکات.»[89] بە واتایەکی تر، هونەر پردێکە مرۆڤ بە کەسە باڵاکەوە دەبەستێتەوە. هەمان هۆشیاری ناکۆتایە لە مرۆڤی تاکەکەسیدا. کەواتە سەرەڕای ئەوەی کە مرۆڤ دروستکراو و ئافرێنراوی خوایە، بەتوانای ئافراندنی خۆی دەتوانێت لە بەرجەستەبوونی یەزدانی نزیك بێتەوە. مرۆڤ بە ئافراندنی بەرهەمێکی هونەری لەڕاستیدا تۆخمی ڕاستەقینەی خۆی دەردەبڕێت. چونکە دنیایەك کە ئەو لە هەناوی

88- Ibid, p.42.

89- Personality, p. 38.

دنیای ماددی و جەستەییەوە داهێناوە و پێشکەشی کردووە، دنیای راستەقینەی خودی ئەو، واتە هەقیقەت و جوانییە. هونەرمەند دنیای بینراو لەدنیای وەنەبینراوی کەسە باڵاکە وە دروست دەکات، وە بە دەربڕینی ئافرێنەرانە لەم (زیاتر) بوونەی خۆی ئاگایی وەدەست دێنێ. بە بڕوای تاگوور، ئەو "زیاتر بوونە" ی کە مرۆڤ لە بوونەوەری تر جیادەکاتەوە «کەسێتی» یە کە لە ئافراندن و جوانیدا ڕەنگ دەداتەوە. جگە لەم رێگەیە دەربازبوون لە کۆتا و یەکبوون لەگەڵ ناکۆتا یان خودا مومکین نییە.

تاگوور لە ناو توێژی بەرفراوانی هونەریدا، لە پایەی شاعیریدا، لە وێنەکێشی و مۆسیقاژەنیدا، و لە تەواوی لایەنە کەسییەکانی خۆیدا بەرەو هەقیقەت هەنگاو دەنێت. پەیامێك کە ئەو لە شیعر و سرود و نووسراوە ئایینی و مەعنەوییەکانیدا دەنێرێ هەر ئەوەیە کە لە دەقە سەرەکییە هیندییەکاندا بە نەمریی ماوەتەوە. تاگوور هەمان مەعنەوییەتی هیندی بەزمانی فێرکاری وەردەگێڕێ لە پێناو خزمەتی برایەتی جیهانی. لەم *کارەدا شێوازی راموهان ڕوی* و بزووتنەوەکەی برەهمو ساماج بە شێوەکەی خۆی بەرەو پێشەوە دەبات. لە وتارێکیدا بە ناوی رۆژهەڵات و رۆژئاوا رێز لە داهێنانە گەورەکەی *ڕوی* دەنێت کە دەرگاکانی لێکتێگەیشتنی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کردۆتەوە: «ژمارەیەك لە ئابڕوومەندترین مرۆڤەکانی هیند هەوڵیاندا تاوەکو ئاشتی لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا دروست بکەن. دەتوانین بە نموونە ڕاموهان ڕوی بهێنینەوە کە بە تاقی تەنیا کۆڵی نەدا لەسەر یەکێتی نێوان هیندستان و



جیهان لە بواری مرۆڤایەتی پەتیدا. بۆچوونی کوێرانە یان ڕێوڕەسمی پێشینان کاری تێ نەکرد و بەرچاوی تاریك نەکرد، و عاقڵانە و بە سینگ فراوانییەکی سەرسوڕهێنەرەوە ڕۆژئاوای لە باوەش گرت، بێ ئەوەی چاو لە ڕۆژهەڵات بپۆشێت ، تەنیا بە پشتبەستن بە تواناکانی خۆی بەنگاڵی نوێی بنیات نا. *ڕوی*، جوامێرانە لە بەردەم بارە قورسەکاندا خۆی ڕاگرت تاوەکو راستییەتی مافی مرۆڤ کە شیاوی پێ سپاردن نییە بۆ هەمووومان وەچنگ بێنێت و تێمان بگەیەنێت کە ئێمە میراتگری جیهانین.»[٩٠] تاگوور دەڵێت پەیامی *ڕوی* زۆر ئاشکرایە و هیچ لێڵییەکی تێدا نییە. مەبەست ئەوەیە کە بە هەر نرخێك بێت پێویستە پردێك لە نێوان میراتی کولتووری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا دروستبکرێت، چونکە ئایندەی هەموو مرۆڤایەتی بەستراوەتەوە بەوەوە. بۆیە تاگوور داوا لە هیندییەکان دەکات لە خۆبایی بوونی نەتەوەیی و دەمارگرژیی کولتووری وەلاوە بنێن و ئایدیاڵی یەکبوونی مرۆڤایەتی پەسند بکەن. تاگوور لەگەڵ ئەوەی هەندێ لایەنی شارستانییەتی رۆژئاوا پەسەند ناکات و دەیانخاتە بەر رەخنەوە، بەڵام زۆر بەتوندی و بەڕاشکاوی ستایشی شانازییە گەورەکانی رۆژئاوا دەکات، بە تایبەت سەرکەوتنە گەورەکانی رۆژئاوا لە بواری پێشکەوتنی زانستدا سەرنجی راکێشاوە. لەوانەیە هەر ئەم بایەخدانە بوو بێتە هۆی ناکۆکی نێوان ئەو و گاندی لەسەر سەرپێچیی مەدەنی. تاگوور بەبێ پەردە خۆی بە لایەنگری ئەنتەرناسیۆنالیزمی دژی ئایدیۆلۆژی و دژی شۆڕش دەناسێنێ و

90- Vers L'Homme Universal, p. 137.

هەموو جۆرە نەتەوەخوازییەکی (ناسیۆنالیزم) بە هەموو فۆرمەکانییەوە ڕەتدەکاتەوە. لە بنەڕەتدا نەتەوەخوازی (ناسیۆنالیزم) بە تیۆرێکی سیاسی دانانێت. دەبێت بزانین کە ئەنتەرناسیۆنالیزم بەتێگەیشتنی تاگووریی هەمان مرۆڤخوازیی (هیومانیزم) جیهانییە کە ڕەگوڕیشەی لە ناخی مرۆڤ دایە. لە نامەیەکدا بۆ چارلز ئەندرۆزی هاوڕێی دەنووسێت : «خەریکین کەشفی دەکەین کە کێشەی ئێمە کێشەیەکی جیهانییە. هیچ نەتەوەیەك ناتوانێت بە جیا لەوانی تر ئازادی بەدەست بێنێت. یان هەموومان بەیەکەوە ڕزگارمان دەبێت یان هەموومان لەناو دەچین. ئەمە هەقیقەتێکی پەسەندکراوە لەلایەن هەموو زانا گەورەکانی جیهانەوە. ئەو زانایانە لەبەر ئەوەی بایەخێکی تەواویان بە ڕۆحی هاوبەشی مرۆڤایەتی داوە، هەمیشە هەموو ڕێنماییەکانیان دژبە هەر جۆرە پاوانخوازییەك بوو... مرۆڤی مەعنەوی هەرگیز دەستی لە هەوڵ و کۆشش هەڵنەگرتووە بۆ پشکۆتن و کامڵبوونی خۆی ، هەر هاوارێکی ڕاستەقینە لە پێناو ئازادیدا هەواڵی ئەم ڕزگاربوونە دەدات. بەرپاکردنی سەنگەرە جوداکارەکان بە ناوی بەرژەوەندی نەتەوەییەوە جۆرێکە لە دروستکردنی زیندان بۆ نەتەوە لە مەودایەکی درێژدا. چونکە تاکە ڕێگای ڕزگاری لە ئایدیاڵی مرۆڤایەتیدایە.»[٩١]

---

91- Rabindranath Tagore, Letters to a Friend, Cite in Saadhar Sinha, Social Thinking of R. Tagore, Asia publishing House, London 1962, p. 44-45.

## بەشی سێیەم

## نەتەوە و نەتەوەخوازی

## گفتوگۆ لەگەڵ گاندیدا

**نیشتمان پەرستی دواجار ناتوانێت پەناگەی مەعنەوی ئێمە بێت. پەناگەی من مرۆڤایەتییە.**

**رابیندرانات تاگوور**

ڕەتکردنەوەی مەسەلەی نەتەوەخوازی لە ناوەندی هزری سیاسی تاگووردا چەقی بەستووە. ئەو کە هێشتا دڕندەیی جەنگی جیهانی یەکەمی لە دڵدابوو، کۆمەڵێك وتاری سەبارەت بە مەسەلەی نەتەوەخوازی (ناسیۆنالیزم) پێشکەش کرد و پاشان وەکو کتێبێك چاپکرا. ئەم وتارانە پیشان دەدەن کە تاگوور تا چ ڕادەیەك دژایەتی هزری نەتەوەخوازی دەکات. تاگوور نەتەوەخوازی بەهۆکاری سەرەکی هەرەسهێنانی ڕۆژئاوا دەزانێ، چونکە دیاردەیەکی دروستکردە کە ڕێگە لە غەریزە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤ دەگرێت. بە پشتبەستن بە شیکردنەوەی ئێرنست ڕێنان، تاگوور دەڵێت پێویستە نەتەوە سەرچاوەی



مەعنەوییەت بێت نەك سیاسەت. چونکە لە گوتاری نەتەوایەتیدا مرۆڤ پڕەنسیبی سەرەکییە. ئایدیاڵی یەکگرتنی مرۆڤایەتی جەوهەری هەموو شارستانییەتەکانە، بەڵام قۆناغەکانی گەیشتن پێی جیاوازن. لە کاتێکدا کە شارستانییەتی هیندی یەکێتی مرۆڤەکانی لەسەر تەوەری کۆمەڵگا (خڕبوونەوە) داناوە، یەکێتی ئەورووپا لەسەر بناغەی سیاسەت دامەزراوە. کێشەی سەرەکی هیندستان زیاتر کۆمەڵایەتییە نەك سیاسی. لەم تێڕوانینەوە شاعیر نەتەوەخوازی بە شتێکی ڕۆژئاوایی دادەنێت کە پەیوەندی بە هیندەکانەوە نییە. لەم ڕووەوە جەخت دەکاتەوە و دەڵێت: «نەتەوەخوازی مەترسییەکی جددییە. ئەم شتە تایبەتە ماوەیەك سەرچاوەی کێشەگەلێکی جددیی بووە لە هیندستاندا، لەگەڵ ئەوەی کە لە ژێر دەسەڵاتی نەتەوەیەکی تەواو سیاسەتکاردا بووین، بەڵام تا ئەو شوێنەی کە دەکرا و وێڕای کەلەپووری ڕابردوومان، رەهەندەکانی بڕوابوون بە پەیامی سیاسیمان لە ناوەوەی خۆماندا پێگەیاندوە.»[٩٢]

بەڕای تاگوور، هیندستان هەرگیز تێگەیشتنێکی ڕاستی بۆ نەتەوەخوازی نەبووە و هەر لەبەر ئەوەش کەسانێك کە خۆیان بە نەتەوەخواز دادەنێن لە ڕوانگەی تاگوورەوە دەکەونە ناو کۆمەڵی چاولێکەرانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیاوە. لە ڕوانگەی ئەوەوە

92- Rabindranath Tagore, "Nationalism", in English Writings of Tagore, Sahitya Akadimi, Delhi, 1996, p. 458.

نەتەوەخوازیی ڕۆژئاوا دەربڕی دەسەڵاتی بەریتانیایە بەسەر هیندستانەوە و هزرێکی ستەمگەرانە و قێزەون و بەدبەختکەرە لە جیهاندا. لەم ڕووەوە دژی هەموو شێوازەکانی هاوسۆزی و گیانی بەشداریکردن، بە شێوەیەك کە لە ڕۆژهەڵاتدا هەیە، دەوەستێتەوە. نەتەوەپەرستی کە لە لای ئەوروپییەکان بوونی هەیە بە هۆی دەسەڵاتخوازیی میللەتانەوە جێگیرویتەو بووە، نەك لە پانتایی هزری مەعنەویی یەکێتی جیهانیدا. نەتەوەپەرستی بە فراوانخوازی و دەسەڵاتخوازییەوە بەستراوەتەوە و هزری ئەبستراکتی نەتەوە سەرچاوەی پەیدابوونی هەموو ئافاتێکی سیاسییە. ئەو دەڵێت: «ئەو حکوومەتەی لە نەتەوە (ناسیۆن) پێکهاتووە، نە بەریتانییە و نە شتێکی ترە؛ زانستێکی بەکارهێنراوە کە بنەماکانی بەپێی پێداویستیی ئەو ژینگەیەی تێیدا بەکاردێ کەم تا زۆر دەگۆڕێت... ئەگەر حکوومەتی ئێمە هۆڵەندی یان فەرەنسی یان پرتوگاڵی بێت بنەماکانیشی هەر وەکو ئەوانە دەبێت».[93]

تاگوور مەترسی چەمکی نەتەوە لە ماهییەتی ناتاکەکەسی بوونیدا دەبینێتەوە. دامەزراوەیەکە بە بێ بوونی هزر و دەسەڵاتێك کە گشت سەرچاوە جەستەیی و ڕەوشتییەکانی مرۆڤ بە مەبەستی بەدەستهێنانی باڵادەستی(دەسەڵات) بەرەو پێشبڕکێیەکی کوشندە ئاراستە دەکات. چەمکی "نەتەوە" تەواو دژی "شارستانییەت"ە. ئەو دەڵێت: «لە

93- Ibid, p.424.



هیندستاندا، ئێمە لە ناکۆکی نێوان رۆحی رۆژئاوا و نەتەوەی رۆژئاوادا لە ئازاردایین. سوودی شارستانییەتی رۆژئاوا بە شێوەیەکی شەرمەزارانە لە "نەتەوە" وە بە ئێمە گەیشتووە»[94] بەقسەی ئەو تەنها سوودێك کە بە هیندستان گەیشتبێت لە هەموو کاروباری ئیجابی شارستانییەتی رۆژئاواوە هەمان رێکخستن و یاسایە تاوەکو ئارامی لەو خاڵەدا بە پارێزراوی بمێنێتەوە. بەڵام ئەو ئاشتی و ئارامییەش چیتر بە زەبری دەزگاکانی کارگێڕییەوە کارامە نییە، چونکە ئاشتی دروستکراو تێگەیشتن لە نێوان مرۆڤەکاندا لەناو دەبات. دەبێت بزانین نەتەوەخوازی هەموو جۆرە گیانێکی ئازادی لە مرۆڤدا دەکوژێت و بە هۆی بلاّوکردنەوەی هەستی نەفرەت و ئیرەیی ژەهراویی دەکات «دنیای ئەمڕۆ لەژێر فشاری کوشندەی ئەم دیاردە نامرۆڤانەیەدا دەناڵێنیّ، کە هەمیشە مرۆڤەکان ئەشکەنجە دەدات و دەیانخاتە پەرێشانییەوە. نە تەنیا نەتەوە گوێڕایەڵەکان، بەڵکو خودی ئێوەی کردووتە ئامانج. ئێوە کە لەو خەیاڵپلاّوییە (وهم)دا دەژین کە وادەزانن بوونەوەری ئازادن هەموو رۆژیّ بەشێك لە مرۆڤایەتی خۆتان بەناوی ئەم بتە خەیاڵییەی نەتەوەخوازییەوە بەفیڕۆ دەدەن و بە هۆی بەدگومانی گشتی و پڕ لە تەماع و مەترسییەوە لە فەزایەکی ژەهراویدا ژیان بەسەر دەبەن.»[95] لەم قسانەدا وا دەردەکەویّ کە تاگوور ناسیونالیزم (نەتەوەخوازی) بە دوژمنی ژمارەیەکی برایەتی نێوان مرۆڤەکان و بە گشتی مرۆڤایەتی

94- Ibid, P. 427.
95- Ibid. P. 425.

دەزانێت. چونکە بەتەعبیری تاگوور مرۆڤایەتی پشت بەڕەوشت دەبەستێ. ئایدیالّی مرۆڤ لە پلەی بوونەوەرێکی کۆمەلاّیەتیدا دەبێت خالّی بێت لە خۆپەرستی. لە کاتێکدا ئایدیالّی نەتەوە خوازی، شۆڤێنزمە، وە پەیوەندی دوژمنانەیە. تاگوور هۆشداری دەدات کە: (( نەتەوەخوازی دابڕان لە نێوان مرۆڤەکاندا دروست دەکات و دوژمنایەتی دەنێتەوە، پەرە بە هەستی خۆ بەزلّزانی لە نێوان نەتەوە جیاوازەکاندا دەدات. لەگەلّ ئەوەی کە جێگەی سەرسوڕمانە، تاگوور لە کاتێکدا ڕەخنەگرێکی سەرسەختی ئەوروپاگەرایی و نەتەوەخوازیی (ناسۆنالیزمی) ئەوروپییە لە هەمانکاتدا وەك بەرگریکەرێکی ڕاستەقینەی ئەورویا هەمیشە هەنگاو بەرەوپێش دەنێت. لە نووسینەکانیدا میراتی کولتووریی ئەوروپا بەڕادەیەك ستایش دەکات کە دەلّێی لە قەلّەمەکەی پۆل ڤالری یان شارل پۆگییەوەیە: ((بێ هیچ دوو دلّییەك پشتگیری لە گەورەیی ئەوروپا دەکەم. گومانی تێدا نییە کە ئەوروپا گەورەیە. ناتوانرێت لە قوولاّیی دلّەوە ئەوروپامان خۆش نەوێت و ئافەرین نەکرێت و ڕێزی لێ نەگیرێت. ئەو ئەوروپایەی کە تاڤگەیەکی بێ سنوور لە جوانی و هەقیقەتی هەلّڕشتووەتە سەر ئەدەبیات و هونەری خۆیەوە و هەموو ولاّتان و هەموو سەردەمەکانی پڕ بەرهەم دەکات. ئەو ئەوروپایەی بە ڕۆحییەتێکی گەورە لە هێزێکی ماندوونەناس و لەبن نەهاتووەوە بەرزی و قوولاّییەکانی جیهانی تێپەڕاندووە بەهۆی ناسینی ئەو شتەی کە بێ کۆتا گەورە و بێ کۆتا بچووك و وردە شایستەی حورمەت و ڕێز لێگرتنە، و هەموو سەرچاوەی



عەقلّی خۆی بە دلّێکی فراوانەوە لە پێناو دەرمان و چارەسەرکردنی نەخۆشەکان و بەدبەختییەکانی مرۆڤدا بەکارهێناوە، کە ئێمە تاوەکو ئێستا تەنیا بە ڕۆحییەتێکی نائومێدی و تەسلیم بوونەوە قبوولّمان کردوون و لە کۆلّمان کردوونەتەوە. بەناچاری دەبێ لە هێزێکی مەعنەویدا بەدوای پالّنەرێکی هێزێکی بەراستی ئاوا گەورەدا بگەڕێین.

تاگوور، بەپێچەوانەی گاندییەوە کە ڕەخنەی توند لە شارستانییەتی مۆدێرنی ڕۆژئاوا دەگرێت، ڕوانگەیەکی توندی بۆ ڕۆژئاوا نییە و خۆشەویستی خۆی بۆ شارستانییەتی ڕۆژئاوا ناشارێتەوە. دەسکەوتە زانستی و هونەرییەکانی مۆدێرن بەرز دەنرخێنێت. لە نامەیەکیدا بۆ چارلز ئەندرۆز دەنووسێت: (( لێرەدا هیوادارین کە لە ئەنجامدا زانست فریای مرۆڤ بکەوێ و پێداویستی ژیانی یەکە یەکەی مرۆڤەکان دابین بکات و بە جۆرێك لە جۆرەکان مرۆڤایەتی کەوا ئێستا لە دوای ماددەدا داماو و زەلیل بووە ڕزگار بکات. ئاشکرایە کە تاگوور لە بارەی بە پیشەسازیکردنی هیند و بە ئامێرکردنی کارەکان لە ڕەگوڕیشەوە لەگەلّ گاندیدا ناکۆکە. بەلاّم ئەو خالّەی ناکۆکی و خالّە جیاوازەکانی تر (بە تایبەتی سەرپێچی مەدەنی بە شێوازی گاندی) لە نێوان ئەم دووانەدا هیچ گرفتێکی لە ڕووی هاوڕێیەتی و ڕێزگرتنی بەرامبەر دروست نەکرد. گاندی هەمیشە لەگەلّ بەرنامە فێرکارییەکانی تاگوور هاوڕابوو. لە لای ترەوە، تاگووریش زۆر

ستایشی ویستی بە هێزی گاندی بۆ ئازاد کردنی هیند بە شێوازی ناتوندوتیژی دەکرد.

لەگەڵ ئەوەشدا لەو بڕوایەدا بوو تا ئەوکاتەی کە خەڵکی هیند شێوازی ناتوندوتیژیی بە شێوەیەکی عاقلانە نەگرنە بەر سەرکەوتوو نابن. تاگوور لە نامەیەکی کراوەدا لە٣ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٢ وەبیر گاندی دەهێنێتەوە کە: (( لەو باوەڕەدام کە ((ئەهیمسا)) (ناتوندوتیژی) لە ریزبوون بەرامبەر فشار وتوندوتیژیدا، کە پشتیوانی زۆربەی هێزە سیاسییەکانە، توانای خۆراگریی و کۆڵنەدانی هەیە، بەڵام بنەما ڕەوشتییەکان وا دەخوازن کە((ئەهیمسا)) لە قووڵایی رۆحەوە بێتە دەرەوە نەك ئەوەی لەکاتی پێویستدا بە پاڵپێوەنانی دەرەکییەوە بەسەر مرۆڤەکاندا بسەپێندرێت)) چەند رۆژێك دوای بلاّوبوونەوەی ئەم نامەیە، هیند کوشتارێکی تری بەخۆیەوە بینی. خۆپێشاندەران لە چۆری چورا هەڵسان بە کوشتنی کارمەندانی پۆلیس. بەڵام مێژوو نیشانیدا هەق لەگەڵ گاندیدایە. بە گشتی حکوومدان دەربارەی هەڵوێستی تاگوور لە بەرامبەر هزری ناتووندوتیژی گاندیدا دژوارە.

یەکەم ئەوەی کە تاگوور وەکو گاندی پابەند بوونی سیاسیی نەبوو. جگە لەوەش، هەرچەندە تاگوور رەفتار و شێوازی ناتوندوتیژی لە خەبات لە رێگای بەرگریکردن لە مافی ستەملێکراواندا بە پێویست دەزانێ، بەڵام بە هەرحاڵ ئەو بیرمەندی تیۆری ناتوندوتیژی نییە. هزری ناتوندوتیژی بەدەگمەن لە بەرهەمەکانیدا بەدیار دەکەوێ. رەگوڕیشەی



وەها هزرێك لە شانۆوەکانی(( سزا)) و ((لافاوی بێ ئامان)) دا دەتوانرێت ببینرێت. هەڵبەت لە رۆمانی بەناوبانگی" ماڵ و جیهان" یشدا توندوتیژی زۆر ریسوا کراوە. لەڕاستیدا، هەرکاتێك قسە لە ناتوندوتیژی دێتە پێش، تاگوور پرسی فێرکردن بۆ رووبەڕووبوونەوەی دەمارگیری و پێشداوەری دەخاتەڕوو و هەمیشە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پێویستە هەموو مرۆڤەکان ئازادی داوەریکردنیان لە بەرامبەر گشت فۆرمەکانی دەسەلاّتدا هەبێت. بەم تەعبیرە لە هەموو دەرفەتێکدا روانگەی پابەندبووی خەڵکی هیند لە پەیڕەو کردنی بنەماکانی گاندی دەخاتە بەر رەخنەوە : (( مەهاتما بە عەشق دڵی هیندییەکانی داگیرکردووە و هەموومان بەم بۆنەیەوە لەبەرامبەریدا سەری رێز دادەنوێنین... ئومێدەوارین کە متمانەی ئێمە بە عەشقی مەهاتما گاندی هەرگیز کەم نەبێتەوە... بەڵام سەربەخۆیی چیرۆکی دار و تەناف نییە. کارێکی گەورەیە کە زیاتر لە جۆش و خرۆش پێویستی بە لێکۆڵینەوە و بیرێکی رۆشنگەرانەیە.

ئابووریناسان و شارەزایانی پەروەردە و فێرکردن، ئەندازیاران و میکانیکییەکان، هەموویان دەبێت لەڕووی تیۆری و پراکتیکییەوە لە وەدەستخستنی وەها کارێکدا بەشداری بکەن. دەبێت خەڵکی هۆشیار بکرێتەوە تاوەکو رۆحی لێکۆڵینەوە گرفتاری داوی گرێکارن نەبێت. هەرگیز نابێت تاکەکان چ بەئاشکرا، چ شاراوەش، بەزۆرەملێ و ترس و تۆقاندن بەرەو بێدەنگی و خاوبوونەوە راکێش بکرێن. مانای ئەم

گوتەیەی تاگوور بە زمانێکی سادە بانگهێشت کردنە بۆ عەقڵێکی ساغڵەم و دژایەتیکردنی خورافاتە کە بەبڕوای ئەو بەسەر زەینی خەڵکی هینددا زاڵ بووە. لەبەر هەمان هۆ لەوانەیە وەکو نارەزایی دەربڕین لە هەمبەر سووتاندنی قوماشی ئینگلیزی کە بە پێشنیاری گاندی بوو هاواری بەرز دەبێتەوە. گاندی وەك نارەزاییەك لە هەمبەر ئەم رێگەچارەیەی گاندی دا دەنووسێت: « فەرمانیاندا قوماشە بێگانەکان بسووتێنن. من بەشبەحاڵی خۆم دەتوانم کە نارەزایی لەبەرامبەر گوێڕایەڵی کوێرانە دەربڕم. خاڵێکی تر ئەوەیە کە هەست دەکەم ئەو قوماشەی کە دەسوتێنرێ هی من نییە. بەڵکو هی ئەو خەڵکەیە کە پێویستییەکی بە پەڵەیان بەو قوماشە هەیە. ئێمە کە دەمانەوێ لەو ئاگر تێبەردانەدا کارێکی فیداکارانە بنوێنین سەرچاوەی ترمان لەبەردەستدایە. بەڵام خەڵکانی تر لەم کارەوە زیانیان پێدەکەوێ. ئەوان دەبێت دەرگا بەڕووی خۆیاندا داخەن و لە ماڵەوە دەرنەچن چونکە رووت و قووتن. دەبێ بزانین سزادانێکی زۆرەملێیانە گوناه ناسڕێتەوە. جگە لەوەش ئەوەندە ناهێنێ کە سوودێکی کەمی بەڕواڵەت لە بەرامبەر لە دەستدانی بیرکردنەوەی پێویستدا وەچنگ بهێنین. مەهاتما شەڕی دژ بە چەوساندنەوەی ئامێری کە دەرهەق بە هەموو دنیا ستەمی کردووە، راگەیاندووە. هەمووومان لە ژێر ئالاَی ئەودایین، بەڵام نابێ تەسلیمی تێڕوانینی (زەینییەتی) کۆیلایەتی بین، چونکە بنەچە و بناخەی گشت بەدبەختی و ناشایستەکانی ژیانمان تا ئێستا لەوەوە سەرچاوەیان گرتووە. دەبێت ئاگاداربین کە رەخنەی



تاگوور ئاراستەی بەرنامەی تاگوور نەکراوە، بەڵکو لە بەرامبەر سیاسەتی « خادی» و «چەرخە» دا وەکو هۆکارێك بۆ وەدەستهێنانی سواراج نارازییە. سواراج بە بڕوای تاگوور بە ناخی مرۆڤەوە بەستراوەتەوە. رەتکردنەوەی قوماشە ئینگلیزییەکە و رستن و چنین ناتوانێت رێخۆشکەری سەربەخۆیی و ئازادی هیند بێت. خەباتی راستەقینە دەبێت خەباتێکی مەعنەوی بێت، بەمەبەستی ئازادکردنی مرۆڤ لەبەندی شۆڤێنزم و ناسیۆنالیزمی توندڕەو. کە وابوو روون و ئاشکرایە کە تاگوور سواراجی لە چوارچێوەی بەرتەسکی « خادی» و « چەرخە» دا ناناسێت و زۆر لەوە زیاتر دەڕوات. هەتاکو رۆحی هیندی لە خەو هەڵنەستێ، سواراج لە ئارادا نابێت. بەڵام تا ئەوکاتەی کە بێدارییەکی فراوانتر لە ئاستی جیهانی و هەسارەی زەویدا بە ئەنجام نەگات، رۆحی هیند بێدار نابێت. دەڵێ ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە بۆچوونێکی تر بخەمە روو: بێدار بوونەوە (هۆشیاری) هیند بەستراوەتەوە بەبێداری هەموو جیهانەوە. ئەم جەنگە نوێیە بە تەواوەتی دەروازەکانی چەرخی نوێی کردووتەوە. گشت خەڵکی دنیا کەم تا زۆر لە بێ خەبەریدا لێك نزیك کەوتوونەتەوە. گشت مرۆڤایەتی مەترسی جەنگ هەست پێ دەکات. چیتر ناتوانرێت نکۆڵی لە پێکەوە بەستران بکرێت... لەمەودوا هەر میللەتێك بە تەنیا و بەجیا هەڵسوکەوت لەگەڵ رۆحی سەردەم بکات ئەوا لە بەدەستهێنانی ئاشتی

ناکام دەبێت. هەموو چوارچێوەیەکی فکری دەبێت لە ئاستی نێونەتەوەییدا چەق ببەستێ. پاڵنەری چەرخی نوێ [١٠٨] بەئاراستەی ڕۆحییەتی جیهانیدا دەگۆڕێ و چاوی بڕیوەتە توانای جیهانی.» تاگوور لە پانتاییەکی فراوانتر و لە ڕووی نێونەتەوەییەوە سەیری "سواراج" دەکات لەبەر هەمان هۆ "چەرخە"ی گاندی وەك ڕەمزی ئاڵای وڵاتی سەربەخۆی هیندی قبووڵ ناکات. لە دیدی ئەوەوە "چەرخە" نیشانەی دواکەوتوویی و پشتکردنە لە تەکنۆلۆژیای مۆدێرن. «لەم ڕۆژانەدا لە وڵاتماندا ئاڵایەکمان کە هێمای«چەرخی» تێدابوو بەرزکردەوە. ئەمە ئاڵای دواکەوتوویی، ئاڵای ڕۆحییەتێکی هەژار، ئاڵای لاوازیی و سەروەت و سامانێکی زۆرکەمە. ئاڵایەك بەم هێمایەوە توانای بێدارکردنەوەی زەینەکانی نییە. هەرگیز ناتوانرێ نەتەوەیەك بە شێوازی دووبارە و کوێرانە و لاساییکەرانە و رووکەشەوە بۆ ئازادی بانگهێشت بکرێ. خۆ ناتوانرێ هەموو مرۆڤایەتی بە هۆی چەرخەوە بۆ بێداری (هۆشیاری) بانگەشە بکرێ »[١٠٩]

گفتوگۆی تاگوور لەگەڵ گاندی هیچ پەیوەندییەکی بە بنەماکانی هزری هندییەوە نییە. باسەکە لەسەر نوێخوازییە. تاگوور تا ئەوکاتەی بە هۆی بەڵگەهێنانی خۆیەوە بنەماکانی سیاسەتی گاندی نەخاتە بەر رەخنەوە، بە هیچ شێوەیەك پێی رازی نابێت. لەلایەکی ترەوە، گاندیش

108- Ibid, pp. 253-254.

109- Plitical Philosophy of R. Tagore, p. 239.



گرینگی بە ڕەخنەکانی تاگوور نادات و درێژە بە ڕێبازەکەی دەدات و لەهەمانکاتدا بە ئەدەب و میهرەبانیی دایمی خۆیەوە بەرگری لە بیروباوەڕی خۆی دەکات و دێتە وەڵام: «لە قسەکانی شاعیردا خاڵێك نادۆزمەوە کە من لە درێژەی بەرگریکردن لە پرۆژەی "چەرخە" دوورخاتەوە. من هەرگیز ئەو شتەی ئەوگاڵتەی پێکردووە نەهێناومەتە سەرزار. دەبێت بڵێم کە شایستەکانی "چەرخە" لە دوای ڕەخنەکانی شاعیرش تا ئێستا لە جێگەی خۆیدان.»[١١٠] ڕوونکردنەوەکانی گاندی ڕێگەی لە ڕخنەکانی تاگوور نەگرت، و جارێکی تر لە زاری یەکێك لە کەسێتییەکانی ڕۆمانی ((ماڵ و جیهان))، ەوە بزووتنەوە سەرپێچیکەرەکەی گاندی دەخاتە ژێر پرسیارەوە و کاردانەوەی سلبی و نارەزایی چالاکانی بزووتنەوەکەی دەوروژێنێ. دەنووسێت: «بەراستی هەست دەکەم کە ئەوان لە تواناییاندا نییە مرۆڤەکانیان خۆش بوێت تەنیا لەبەر ئەوەی مرۆڤن. ئەوەی کە هاوار دەکەن و وڵات بە یەزدان دەگەیەنن تەنیا لەبەر پێویستییانە بەجۆش و خرۆش و هەڵچوون نەك شتێکی تر. ئەم کەسانە جۆش وخرۆشیان لە وڵاتەکەیان زیاتر خۆش دەوێت... تا ئەوکاتەی کە سەرسەختانە لەگەڵ هەقیقەتدا دەستەو یەخەبووین و پەنامان بردە بەر پاڵنەرە خەوهێنەرەکان دەبێ بزانین کە

110- Ibid, p. 237.

هەوێنی خودموختاریمان نییە. بەم شێوەیە بەردەوام پێویستیمان بە تارماییەکی خەیاڵاوی یان جادوو هەیە کە بمانخاتە ترسەوە.»[111]

تاگوور بەبێ پەردە پۆشکردن و بێ دوودڵی هەر جۆرە ڕۆحییەتێکی خۆرافاتی و هەڵسوکەوتە سەرنجڕاکێشەرەکان (کاریزماتیك) لە ناو سیاسەتدا ڕەت دەکاتەوە. بڕوای وایە کە ئایین لە مرۆڤدا بە تەواوی ڕەنگیداوەتەوە. لەم ڕووەوە مرۆڤ لە نیوەندی هزری ئایینی تاگوور دا چەقی بەستووە.- مرۆڤ بە مانا جیهانییەکەی. بە پێچەوانەی گاندییەوە بیروباوەڕێکی ئەوتۆشی بە یەکبوونی ئایینە جیاوازەکانی وەك هیندۆ، ئیسلام، مەسیحییەت و یەهودیش نییە. لەسەرزەمینی ئایینی مرۆڤایەتیدا بە دوای مانای راستەقینەی گشت ئایینەکاندا دەگەڕێ.

ئایینی مرۆڤایەتی یاخود ئایینی تاکەکەسیانەی مرۆڤ واتە نەبوونی دەستێوەردانی قودسی (پیرۆزمەندیی) لە کاروباری مرۆڤەکاندا. پێداگرتنی تاگوور لەسەر ئەم خاڵەی دوایی وایلێکرد تاکو لە کارەساتی بوومەلەرزەی بیهار لە ١٩٣٤ دا دژ بەگاندی رابوەستێت. گاندی گوتبووی درێژەدان بە نەریتی ناشرینی دوورخستنەوەی پیسابییەکان لەو ویلایەتەدا بووەتە هۆی توڕەیی خواوەندەکان.

تاگوور وەلاّم دەداتەوە: «بێحورمەتییەکی تەواوە کە سەرچاوەی کارەساتە سروشتییەکان لە دەرەوەی پێکهاتەی هۆکارە ماددییەکاندا

111- Rabindranth Tagore, The Home and. The Wold, Macmilan, London, 1961. p. 45



بزانین بۆیە لە ناخەوە هەست بە شەمەزاری دەکەم لەمبابەتەوە. مەگەر ئەوەی لەو بڕوایەدابین کە یاسا جیهانییەکان کە خوا دەستی راستەوخۆی تێدا نییە، تەواوی دروستکراوەکانی خۆی دەخاتە مەترسییەوە...ئێمە کە بێ ئەندازە ڕێز لە هەوڵەکانی مەهاتماجی دەنێین لە وروژاندنی گیانی ئازادی لە دژی ترس و لاوازی لەزەینی هاونیشتمانەکانیدا بەلاّم بە هۆی ئەو شتەی بەبێ ویستی خۆی دێنێتە سەرزار و جەخت لەسەر تۆخمی ناعەقلانّی دەکات لە ناخمانەوە ئازاردەکێشین. چونکە سەرچاوەی سەرەکی ئەو هێزە کوێرانەی کە ڕێگا لە ئازادی و حورمەتی ئێمە دەگرێت هەر ئەم ناعەقلانّییەتەیە.»[112] وەك دەبینین تاگوور هیچ بەرنامەیەکی سیاسی کە خاڵی لە ڕەخنەی عەقلانی بێت پەسند ناکات و تەنیا ڕێگەی گەیشتن بە ڕەخنەی عەقلانیش لە چوارچێوەی فێرکاریدا بە مومکین دەزانێت. بەبێ فیرکردنی خەڵك هەرگیز ناتوانرێت «سواراج»ی ڕاستەقینە بەدەست بهێنرێت. فێرکردنی خەڵك واتە ئازادکردنی ڕۆحی ئەوان لە هەر شتێکی هەڕەمەکی و ناداهێنەرانە. ئەگەر بتوانم یەك دوو لادێ لە گێژاوی نەزانین و هەژاری رزگار بکەم لە پێوەرێکی ورد دا ئایدیاڵێك بۆ سەرتاسەری هیند بنیات دەنرێت.»[113]

112- Ibid, P. 243

113- Sasahar Sonha, Social Thinking of rabindraia Tagore, P. 98.

## بەشی چوارەم

### شانتی نیکتان یان هونەری فێرکاری

**شانتی نیکتان ئاوێتەیەکی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە من دروستکرد.**

**رابیندرانات تاگوور**

پرسی فێرکردن لە چەقی هزری کۆمەڵایەتی-سیاسی تاگووردا جێگەی گرتووە. تاگوور تیۆرە جۆراوجۆرەکانی خۆی لە بواری ئاین، سیاسەت، کۆمەڵگا و هونەر، هەموویان دەخاتە چوارچێوەی فێرکردنەوە و لەم ئاراستەیەدا دەیانخاتە ڕوو. ئەو دەڵێت: « فێرکردن کەشتییەکە گرانترین کەل و پەلەکانی ژیانی هەڵگرتووە.»[١١٤] فێرکردن کلیلی سیستەمی هزری تاگوورە. تاگوور لە ڕێگەی فێرکردنەوە گیان بە هزری هیندی دەبەخشێت و هاوکات ڕێگەیەك دەباتەوە بۆ ناو کولتووری ڕۆژئاوا. بەم شێوەیە بە دۆزینەوەی تێکەڵەیەك لە هەندێ نەریتی فێرکاریی هیندی کۆن و ئایدیاڵی جیهانی مرۆڤایەتی خۆی، دواجار تاگوور لە تشرینی دووەمی ١٩٠١

114-Joseph T. O'Connell, Tagore's Herotage in Canada, Tprpnto, 1989. p. 92.



قوتابخانەی شانتی نیکتان (ئارامگا)ی دامەزراند. شانتی نیکتان لە بیرەوەری تاگووردا شوێنێکی زۆر ڕەمزیی بوو. لەسەردەمی مێردمنداڵیدا لە سەفەرێك لەگەڵ باوکی بۆ ئەو شوێنە، بەدەر لە تەنگوچەڵەمەی قوتابخانەوە، تامی ئارامی و شادی چەشتبووی. کەواتە شانتی نیکتان لە هزری تاگووردا ڕەمزی شوێن یان دنیایەکی خەیاڵیی سەردەمی منداڵییە. شوێنێك کەتیایدا بە ئازادییەکی تەواو دەتوانرێت ئەفراندن بکرێت. تاگوور بەردەوام لە نووسینە فێرکارییەکانیدا شانتی نیکتان، کە ئایدیاڵی داهێنەرێتی مرۆڤ دەوڵەمەند دەکات، لەگەڵ سیستەمی فێرکاریی نەریتیدا بەراورد دەکات، کە منداڵەکان لە چوارچێوەی دیواری قوتابخانەدا زیندانی دەکەن و دەیانخەنە ژێر فشاری پێگوتن (تلقین)ەوە. «ئەوەی ئەمڕۆ لەم وڵاتەدا ناوی دەنێین قوتابخانە لە ڕاستیدا کارگەیەکە کە مامۆستایانیش بەشێکن لێی. کاتژمێر دە و نیوی بەیانی بە دەنگی زەنگ دەرگای کارگە دەکرێتەوە و ڕێك وەك کەوتنە کاری مەکینەکان، مامۆستاکان دەکەونە قسە. کاتژمێر چواری پاش نیوەڕۆش مامۆستاکان دەمیان دادەخەن. کە دەوامی کارگە تەواو بوو و قوتابییەکان بۆ ماڵەوە گەڕانەوە تەنیا چەند لاپەڕەیەك زانستی هەڵبەستراویان لەگەڵ خۆیاندا دەبەنەوە و چیتر نا. دواتر تاقیکردنەوە لەم زانستەدا دەکەن و مۆری پشتگیریی لێ دەدەن... ئەم قوتابخانانە بە هیچ شێوەیەك لە کارگەکانی ڕۆبۆت سازی باشتر نین.»[١١٥]
تاگوور هەمیشە تەئکیدی لەسەر ئازادی منداڵان دەکردەوە و

115- Vers L'homme Universel, pp. 80-81.

هەستیارییێکی تایبەتی بەرامبەر بەمە هەبوو. مامۆستاکانی ئاگادار دەکردەوە کە هەموو جۆرە ئاستەنگێکی دەرەکی کە پەیوەندی نزیکی نێوان منداڵ و سروشت تێکدەدات لە ڕێگەیاندا لابەرن، چونکە یەکەمین هەنگاو لە پەروەردە و فێرکردندا لێوانلێوکردنی ڕۆحی منداڵە لە جوانی و گونجاندن لەگەڵ سروشتدا. هەندێ جار کاریگەری ڕۆمانتیکە ئەوروپییەکان لەسەر تاگوور دەردەکەوێت. بۆ نموونە هەندێ برگە لە باسی پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکەیدا ئاماژەن بۆ بەرهەمەکەی ژان ژاك ڕۆسۆ بەناوی ئەمیل. «یەکەمین کارم دوورخستنەوەی کوڕەکەم بوو لە شار و ڕەوانەکردنی بوو بۆ لادێ. دەمویست تا ئەو رادەیەی لەم ڕۆژگارەدا دەکرێ لە سروشتی دەست لێنەدراودا سوود لە ژیان و ئازادی وەربگرێت. لە لادێدا بەبێ ترس و نیگەرانی و چاودێریی گەورەکان لە ڕووبارێکی مەترسیداردا مەلەی دەکرد و بەلەمی ڕادەدا. ڕۆژانە لە کێڵگە و کەنارە دەست لێنەدراوەکاندا ئازادانە دەگەڕا و درەنگانێك بۆ نانخواردن دەگەڕایەوە ماڵەوە بێ ئەوەی لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکرێ. کوڕەکەم لە هەموو جۆرە جوانکارییەکی کوڕانە یان ئەوەی لەو ڕۆژگاردا باو بوو بەگشتی بێ بەش بوو.»[١١٦]

لە پەروەردە و فێرکردنی تاگووردا ئامانج ئەوەبوو کە بتوانرێ بە شێوازێکی گونجاو و هاوئاهەنگ تواناکانی مرۆڤ کە بۆ دروستبوونی کەسێتییەکی

116- Social Thinking of R Tagore, P. 61.



کامڵ پێویستە پەروەردە بکرێن. پەروەردە و فێرکردنی دروست دەبێت دەرگاکانی زەین و خەیاڵی منداڵ بکاتەوە چونکە: «مرۆڤ پێویستییەکی زۆری بە توانای هزر و خەیاڵ هەیە بۆ ئەوەی ئەرکەکانی ژیانی ڕاپەڕێنێت و ئەگەرهات و لە منداڵیدا فێری ئەوشتە نەبوو ئەوا لە گەورەییشدا نایەتە دی.»[١١٧]

لە تیۆری فێرکاریی تاگووردا، جەخت لەسەر داهێنان و پێگەیشتنی منداڵ لە لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیان کراوەتەوە بۆ ئەوەی تاك بە چاوی ئومێد و گەشبینەوە بڕوانێتە جیهان نەك بە بێ ئومێدی و ئینکارییەوە. تاگوور لە ڕێوڕەسمی کردنەوەی زانکۆی نێونەتەوەیی خۆی بەناوی ڤیسڤا-بهاراتی[١١٨] دەڵێت: «پەروەردە و فێرکردنی ئێمە دەبێت تەواو لەگەڵ ژیانی ئابووری، عەقڵانی، جوانناسی، کۆمەڵایەتی و ڕۆحی ئێمەدا بگونجێت. نابێ هانی زیقەتی دروستکردن بۆ کولتوور و تێکدانی ژیانی ئەوانی تر بدرێت.»[١١٩]

تاگوور لە بواری فێرکردندا قسەی تازەی پێیە و مەبەستێکی فراوانی هەیە. پەروەردە و فێرکردنی تاگوور گشتگیرە. فێرکردنی پشتبەستوو بە هۆشیاریی ئامانجدار و یەزدانی- کە بەهاکانی تری ژیانیشی لێهەڵدێنجێت. بەڵام جگە لە یەکێتی ڕوح و جەستە و جیهان ناتوانین بەو

117- Vers L'homme Universel, p. 58.

118- Visva- Bharati.

119- Bhudeb Chaudhuri- K-G. Subramanyan, Rabrindranath Tagore and Challenges of Today Indian Institute of Advanced Study, Shima, 1988, p. 160.

مەیدانەی هۆشیاریی بگەین. ئەو دەپرسێت «ئامانجی پەروەردە و فێرکردن چییە جگە لە گەیاندنی مرۆڤ بە هەقیقەت ؟»[120] لەو بڕوایە دایە کە گونجاندنی ژیانی بایولۆژی لەگەڵ ژیانی مەعنەویدا، مرۆڤ بە هەقیقەت دەگەیەنێت و لەگەڵ ئەودا یەکێتییەك دروست دەكات.

بە بڕوای تاگوور، ئازادی و پشکۆتنی تاك لە داجار بە ئایدیاڵی گفتوگۆی نێوان کولتوورەکانەوە دەبەسترێتەوە. بیرۆکەی ئاوێتەکردنی بەهاکان و شارستانییەتەکان لە کۆتاییدا لەگەڵ کردنەوەی زانکۆی ڤیسڤا-بهاراتی لە ١٩٢١دا لەدایك بوو. تاگوور ئەم دروشمەی بۆ ڕازاندنەوەی بەر دەرگای زانکۆ هەڵبژارد: لێرەدا جیهان تەنیا لە سەرایەکدا ژیان بەسەر دەبات.[121] لەوانەیە بە تەنیا ئەم دروشمە دەربڕی ئامانجی تاگوور-یەکێتی نێوان شارستانییەتەکان بێت. تاگوور لەڕێی ئەم دروشمەوە دەردەخات کە بەهیوای ئەو ڕۆژەیە کە دونیایەکی یەکگرتوو بە بەشداریی هیندستان لەگەڵ وڵاتانی تردا بێتەکایەوە. ئەو دەڵێت: «ئەو کێشەیەی ئێستا لەگەڵیدا ڕووبەڕووین، یەك وڵاتە -هەسارەی زەوی- کە تاکەکان لە ئازادی و ڕادەبڕینی خۆیان بەهرەمەندبن و گەیشتنی خۆیان بە "فیدراس یۆن" تیایدا بدۆزنەوە. مرۆڤایەتی دەبێت بە هەوڵی زیاتر، هەستی قووڵتر، و توانای زیاتر بگاتە یەکبوون.»[122]

120- Rabindranath Tagore, Lecturs and Addresses, Macmillan, p. 27.
121- Ye Tra Visvam Bhabatyekami Dam.
122- Social Thinking of R. Tagore. 86.



بەم شێوەیە تاگوور، لە ڕێی کردنەوەی ڤیسڤا— بهاراتی هەوڵدەدات جارێکی تر خەونی شانتی نیکتان بچەسپێنێت- گەڕان بەدوای هەقیقەتدا بە گیانێکی برایانەی جیهانی دوور لە هەموو چەشنە دەمارگیرییەکی ڕەگەزپەرستانە و توندوتیژی. بەم قسانە گوزارشت لەم هیوایەتە دەکات: «گومانی تێدا نییە کە بە هۆی گیانێکی هاوبەشەوە بۆ گەڕان بەدوای هەقیقەت دەتوانین بە یەکەوە کار بکەین. دەتوانین کەلەپوری هاوبەش لە نێوان خۆماندا دابەش بکەین و ئومێدمان بەوە هەبێت کە مەبەستی هەموو ئەو هونەرمەندانەی جوانی دەخولقێنن، هەموو ئەو بیرمەندانەی کە نهێنییەکانی گەردوون دەدۆزنەوە، هەموو ئەو قەدیسانەی کە هەقیقەتی دونیای مانا لە ژیانی تایبەتی خۆیاندا بەرجەستە دەکەن، گشت مرۆڤایەتی بێت، نەك کارێکی دەگمەنی تایبەت.»[123]

لەو نڤارەی (داهێنانەی) تاگوورەوە، کۆمەڵێك زانا، چ هیندی و چ ئەوروپایی کەڵکەڵەی ئەوە هاتە مێشکیان و ئەو بەرنامەیە سەرنجی ڕاکێشان و ڕوویان لە ڤیسڤا-بهاراتی کرد. یەکێ لەو کەسانە بریتی بوو لە سیلڤان لیڤی،[124] مامۆستای کولێژی دوفرانس کە لە یەکەمین مێوانەکانی زانکۆی تاگوور بوو. دواتر وینتەر نیتز[125] و لیزنی[126] لە پراگەوە هاتن،

123- Ibid. p. 89
124- Sytvain Lavi.
125- Winterniz.
126- Lesny.

هەروەها پرۆفیسۆر توچی،[١٢٧] هیندناسی ناوداری ئیتاڵیایی. بەڵام بەر لە هەموویان، دوو هاورێی وەفاداری تاگوور لەو مەڵبەندەدا بەکارەوە خەریك بوون- چارلز ئەندرۆز، کە لەوەو پێش مەهاتما گاندی ناسیبوو، و ولیام پیرسۆن،[١٢٨] دانەری کتێبی بەناوبانگی شانتی نیکتان قوتابخانەی تاگوور لە بۆلپور.[١٢٩] لەم کتێبەدا پیرسۆن باس لە چۆنیەتی هەڵبژاردن و پێکهێنانی چەند لیژنەیەك دەکات بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری قوتابخانە کە لە قوتابیان خۆیان پێکهێنرابن. تاگوور خۆی دەربارەی پرۆگرام و بەرنامەی ڕۆژانەی قوتابخانە و کۆلێژەکەی ئەوەندە قسەی نەکردووە، بەڵام دەزانین کە نموونەی «تاپۆڤانا»ی[١٣٠] لەبەر چاو بووە کە ڕێبازی ئەو دەروێشانەیە کە بە دوای دەوڵەمەندکردنی ناخ و سادەیی ڕووخساردا وێڵن. بە بڕوای تاگوور، ئەگەر ڕێگە بە منداڵ بدەین بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ سروشتدا ببەستێت، مانای جوانی و تەڕ و تازەیی ژیان هەست پێ دەکات. هەر لەبەر ئەوە وا بە باشتر دەزانێت کە پرۆسەی فێرکاری لەژێر درەخت یان لە ژینگەیەکی کراوەدا ئەنجام بدرێت بۆ ئەوەی لە نێوان مرۆڤ و ژینگەی سروشتیدا هاوئاهەنگی دروست ببێت، نەك قوتابییەکان لە ژوورە داخراوەکان و دوور لە ژیان بەند بکرێن. وەك ئەو دەڵێت: «ئێمە دەبێت بە شێوەیەکی سروشتی کێوی و بە شێوەیەکی عەقڵانی مەدەنی بین. بەو شێوەیەی کە لە

127- Tucci.
128- William pearson.
129- Shaniniketan, The Bplpur School of Rpobindranath Tagore
130- Tapovanas



کەشوهەوای سروشتدا بوونەوەرێکی سروشتی و لە ژینگەیەکی کۆمەڵایەتیدا مرۆڤ بین.»[١٣١]

لەبەر ئەوەی تاگوور پێیوایە باشترین ڕێگەی گونجان لە دنیادا خەریکبوونە بە کاری هونەرییەوە، لە فێرکاریشدا بایەخێکی تایبەت بە فێربوونی هونەر دەدات، چونکە لەو بڕوایە دایە کە هونەر کەسایەتی منداڵ هاوسەنگ و هاوئاهەنگ باردێنێ. بۆیە تاگوور منداڵان بانگ دەکات کە بێنە قوتابخانەکەی و هەتا حەزدەکەن گۆرانی بڵێن و وێنە بکێشن. هەر لەبەر ئەوە سێ بەشی لە شانتی نیکتان کردەوە: کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان،[١٣٢] کۆمەڵەی مۆسیقا ژەنی،[١٣٣] و کۆمەڵەی هیندناسی کە تایبەت بوو بە وتنەوەی دەقە ڤودایی و چینییەکان. ئەم بەشانە دواتر گوازرانەوە بۆ سەر زانکۆی ڤیسڤا- بهاراتی و فراوان بوون تاوەکو قوتابییانی میوان لەو مەڵبەندەدا زمانەکانی یابانی و چینی و فارسی فێربن. هەروەها وتنەوەی وانەکانی بەشی مێژوو و جوگرافیای وڵاتانی ئاسیای خستە سەر شانی خۆی.

لە شوباتی ١٩٢٢دا، دوو مانگ دوای دەست بەکارکردنی ڤیسڤا- بهاراتی، تاگوور کەوتە بیری دامەزراندنی *شیری نیکتان*-[١٣٤] مەڵبەندێك بۆ

131- Rabindranath Tagore, Visva – Barati and its institutions, Calcutta, 1961, p. 8.
132- Kala Bhavan
133- Sangit Bhavan
134-Siriniketan

پەرەپێدانی کاروباری لادێ لە سورول.[١٣٥] تاگوور لە بیری ئەوەدا بوو کە شیری نیکتان=سەرای پەرەپێدان، ببێتە مەڵبەندێکی گەورە کە کۆمەڵێك لە ئابووریناسان و پزیشك و ئەندازیارانی کشتوکاڵی لە خزمەتی پەرەپێدانی ئابووریی لادێ لەوێدا کۆببنەوە. بە بڕوای تاگوور شیری نیکتان دامەزراوەی ڕاستەقینەی «سواراج» بوو. بەم پێیە بە یارمەتی راتیندراناتی[١٣٦] کوڕی و هاوکاریی پسپۆری کشتوکاڵی بە ناوی لیۆنارد ئیلم هێرست،[١٣٧] کە خەڵکی بەریتانیا و لە زانکۆی ئیلینویز لە بەشی کشتوکاڵ خوێندبووی، پێشنیاری کردنەوەی مەڵبەندێکی کرد بۆ بەرهەمهێنان و پەرەپێدانی پیشەسازیی کشتوکاڵی. تاگوور ئەوەندە بە کەوتنەوەکاری ئەم ڕێکخراوە شادمان بوو کە لە نامەیەکی بۆ ئیلم هێرست نووسیی: «هەموو ڕۆژێك لە دڵەوە زیاتر ئیرەیی بە "سواراج"ی تۆ دەبەم. بە تایبەت کە بیستم باڵندەکانی تۆ قەرزی خۆیان بە بازاڕی لە سوود هاوبەشدا داوەتەوە. ئەفلاتون لە کۆمارەکەیدا پێگەیەکی بۆ شاعیران دانەنا... خۆزگە گەنجتر بوومایە و دەمتوانی بێمە تەك ئێوە و نزمترین کارم لە ڕێکخراوەکەی تۆدا لە ئەستۆ بگرتایە.»[١٣٨]

---

135- Surul
136- Rathindranath.
137- Leonard Elmbirst.
138- Social Thinking of R. Tagore, p. 96.



لە کاتی دامەزراندنی شیری نیکتاندا تاگوور شەست و یەك ساڵ بوو و چیتر نەیدەتوانی ڕۆڵێکی ئەوەندە چالاکی لە بەرەوپێش بردنی بەرنامەکانی ئەم ڕێکخراوەدا هەبێت. لەگەڵ ئەمانەشدا شیری نیکتانی بە سەرکەوتنێکی گەورەی ژیانی خۆی دەزانی و بە هەنگاوێکی گەورەی دەزانی لە پێناو سەربەخۆیی ئابووری هیندستاندا. ئەو پێیوابوو ئەزموونی شیری نیکتان دەتوانێت نموونەی پرۆژەیەکی ئایدیاڵ بێت لە سەرتاسەری وڵاتی هیندستاندا. بەم شێوەیە هزری پەروەردە و فێرکاریی تاگوور بە جۆرێك کە لە سێ ڕێکخراوی شانتی نیکتان، ڤیسڤا- بهاراتی و شیری نیکتاندا جێ بەجێکرا، لە بنچینەدا هەوڵێکی بێ وچان بوو لە پاشەکشەپێکردنی ئەو دەمارگیرییەی بەسەر ژیانی ماددیدا باڵادەست بوو و جێگرتنەوەی بوو بە فەزیلەتە گەورەکانی وەك شەڕەفمەندی و ڕاستگۆیی و مرۆڤایەتی. هەموو هەوڵێکی بۆ ئەوە بوو کە ڕەوتی یەکبوون لەگەڵ هەموو مەعریفەکان دەربخات. لەبەر هەمان هۆ کولتووری لە شەبەنگێکی زۆر بەرفراواندا دەخاتە ڕوو کە کۆڵەکە سەرەکییەکانی بریتین لە هونەر، مۆسیقا، ئەدەبیات، ئایین و فەلسەفە. تاگوور دوایین کەسایەتی ئینسکلۆپیدیایی هیندی بوو. کەسایەتییەکی عەوداڵی بەستنەوەی جیهان بە هەموو زانین و مەعریفەیەکی مرۆیی. کەسێك کە بە کردنەوەی دەرگاکانی جیهان، فێرکردنی لە ژینگەی چالاکییەکی سروشتیدا، ئازاد کرد. ئەو دەڵێت بەبێ ئازادی جەوهەری داهێنەرانەی فێرکاری تەواو لە ناو دەچێت. کەواتە پەیامی قوتابخانە و پەروەردە و فێرکردن دابینکردنی ژینگەیەکی

هاوئاهەنگە لە نێوان منداڵ و جیهاندا. ئامانجی فێرکاری ئەوە نییە کە لەم یا لەو بەشەدا پسپۆڕ دروستبکات. زەینی مرۆڤەکان دەبێ بکرێتەوە و بنیاتنە ربکرێ تاوەکو هاوسەنگییەك لە تواناکانیاندا دروست بکات. بەکورتی، ئامانجی فێرکاریی تاگوور ئازادکردنی مرۆڤەکانە. «ئازادی لە دایکبوونەوەیەکی هەمیشەییە، واتە سەرلەنوێ دەستپێکردن و درێژەدان و ئەزموونکردنی کۆنەکان تاوەکو بە هۆی چەند ئایدیایەکی بنچینەیی لە هەقیقەت بتوانرێت هاوئاهەنگییەکی تەواوتر بەدەست بهێنرێت.»[١٣٩]

تاگوور زیاتر بایەخی بە نوێکردنەوەی خودیانە-کە سەرەتای بۆچوونی تاگوورە بۆ مرۆڤ- داوە نەك نرخاندنی مرۆڤ لە چوارچێوەی کۆمەڵایەتی-سیاسیدا. بەردەوام عەودالّی یەکێتییەکی بنیاتنەرانە بوو بۆ مرۆڤ لەلایەن مرۆڤەوە. پەروەردە و فێرکاری بنچینەیەکی سەرەکی دێنێتەکایەوە بۆ ئەوەی کاری هاوئاهەنگی جیهانی لە نێوان مرۆڤەکاندا بێتەدی. تاگوور فێرکاری بە «سەردانی دانایی و چاوکراوەیی» ناودەبات. لە وتارێکیدا لە قوتابخانەی شانتی نیکتان لە ساڵی ١٩٢٣ ڕادەگەیەنێت: «سەردانی دانایی و چاوکراوەیی لە چەقی یەکێتیی شارستانییەتەکاندا شوێنی خۆی هەیە. دەتوانێت نەتەوە جیاوازەکان لە چوارگۆشەی دنیایەوە کۆ بکاتەوە. یەکێتی دانایی لە شارستانییەتە گەورەکاندا پێشینەی هەیە -وەك ڕۆم و یۆنانی کۆن. دەبینین پەنابردنە بەر یەکێتی هەرگیز لە بۆتەی فەرامۆشیدا نەبووە

139- Rabindranath Tagore, The Religion of Man, Harper Collins, New Delhi, 1988. p34.



کە بە مێژوو بسپێردری. یەکێتیی زۆر بەرفراوانی نەتەوە جیاوازەکان، لەوانە ئارییەکان، دراڤیدییەکان، پارسەکان لە هیندستانیشدا ئەم ڕێبازەیان بڕیوە. دەبێت ڕێز لەم گونجانە بگرین... کاتی ئەوە هاتووە جیهانی مرۆڤایەتی وەکو خۆی پەسند بکەین. بە عەشق و عەقڵ تێبگەین کە مرۆڤ نوێنەری هیچ هۆزێکی تایبەت نییە. دیارترین ناسنامەی مرۆڤ خودی مرۆڤە. ئیتر کاتی ئەوەیە کە بەڕاستی قبووڵ بکەین کە مرۆڤ لە تەواوی وڵاتەکان و تەواوی سەردەمەکاندا بوونی هەیە و بۆ ناکۆکی نەتەوەیی و جیاوازی ڕەنگ هیچ شوێنێکی نییە.»[١٤٠] «ویژدانی جیهان» هەقیقەتی مرۆڤە. مرۆڤ دەبێت ڕێگری فەردانییەت تێبپەڕێنێت و خۆی لەگەڵ هەموو خەڵك بەیەك بزانێت بۆ ئەوەی بە «ویژدانی جیهانی» بگات. پێویستە هەقیقەتی خۆی لە ڕێی هەقیقەتێکی گرینگتر و گەورەترەوە -هەقیقەتی جیهانی کە پەیوەستە بە هەموو مرۆڤایەتییەوە، بەرجەستە بکات. جگە لەم ڕێگەیە هەرگیز مرۆڤ ناتوانێت تامی هاوئاهەنگیی بوون (وجود) بکات. تەنیا بەم شێوەیەش دەتوانرێت پارێزگاری لە شارستانییەتی مرۆڤایەتی بکرێت بەرامبەر بەو قەیرانەی کە لەسەر ڕێیەتی.

140- Rabindranath Tagore, "Shumtiniketan Patrika". Cite in Mohit Chakrarti Phiosophy of Education of R. Tagor, Atlantic Publishers, New Delhi, 1988. p. 75.

## بەشی پێنچەم

### قەیرانی شارستانییەت یان وەسیەتنامەی تاگوور

**بە بڕوای من شارستانییەتی مرۆڤایەتی بە هاوکاری و بەشداریکردن لەگەڵ شارستانییەتە جۆراوجۆرەکاندا بە پتەوی دەمێنێتەوە.**

**رابیندرات تاگوور**

لە ئازاری ١٩٤١، پێنج مانگ پێش مردنی، تاگوور وتارێکی بەناویانگی بە ناوی **قەیرانی شارستانییەتەکانەوە** نووسی کە ئەوە بە دوایەمین وەسیەتنامەی تاگوور دادەنرێت. ئەم وتارە لە چواری نیسان بە ئامادەبوونی خودی شاعیر لە شانتی نیکتان خوێندرایەوە. تاگوور لەم وتارەدا جارێکی تر تەئکیدی لەسەر بنەمای گشتگیریی جیهان و ئومێد بە مرۆڤایەتی کردەوە. بەڵام ئیتر بە چاوی ئومێدەوە نەیدەڕوانیە ڕۆژئاوا. نائومێدانە هۆشداری دەدا: «تارماییەکی وەحشیگەرانەی تازە» ڕۆژئاوا چاوترسان دەکات: «ڕۆحی توندوتیژی کە بە ڕووکەش لە ڕۆژئاوادا ئارامی گرتبوو، بە مەبەستی بێ حورمەتکردنی رۆحی



مرۆڤ دووبارە سەری هەڵداوەتەوە.»[١٤١] لەم وتارەدا شایەدی ناکامی پیرەمێردێکین کە لە هەواڵی جەنگی جیهانی دووەم و کارەساتەکانی فاشیزم لە ئەورووپا شکاوە. لەلایەکی ترەوە بێزاریش لە حکوومەتی بەریتانیا ناشارێتەوە کە «نەتەوە ژێر دەستەکانی پەیماڵکردووە و لە حاڵەتی مەرگدا ڕایگرتوون»[١٤٢] لەگەڵ ئەمەشدا بێ لایەنی هەمیشەیی خۆی دەپارێزێت و ستایشی سیفەتەکانی هاورێکەی چارلز ئەندرۆز دەکات: «بەڵام بەختم هەبوو کە ئینگلیزە پاك داوێنەکانم ناسی و بە هۆی ئەو کەسە دڵ فراوانانە وە متمانەم بە هاونیشتمانەکانم و هاوڕێکانم لە دەست نەدەم. ئەندرۆز وەك نموونە بهێنمەوە: ئینگلیزێك، مەسیحییەکی راستەقینە، پیاوێکی تەواو بێگەرد کە هاورێیەکی زۆر نزیکی من بوو. بیرەوەرییەکانی ئەندرۆز هەمیشە سیفەتی گەورەیی ئینگلیزی وەبیرم دەهێنێتەوە. مرۆڤەکانی وەك ئەو کە هاورێی هەموو مرۆڤایەتین، لە هەڤاڵە هەرە باشەکانی منن.»[١٤٣] بە بڕوای تاگوور مرۆڤەکانی وەك ئەندرۆز دەتوانن بەریتانییەکانی ناو کەشتییەك لەکاتی نقوم بووندا بە کەناری ئاسایش بگەینن، نقوم بوون کە بەشێکە لە ئاکامەکانی دوژمنایەتی خودی ئەوانەی کە نایانەوێت دەست لە ئازار و چەوسانەوەی خەڵکی هیند هەڵبگرن. تاگوور دڵنیایە لە ئەنجامدا رۆژێك بەریتانییەکان بە ناچاری هیند بەجێ دەهێڵن. بەڵام ئەو شتەی دەیخاتە مەترسییەوە چارەنووسی ئایندەی هیندە لە دوای ڕزگاربوونی لەژێر دەستی

---

141- Vers L' home Universel, p. 329

142- Ibid, p. 327.

143- Ibid, p. 329.

بەریتانیا: «چەرخی چارەنووس ڕۆژێك بەریتانیای مەزن ناچار دەكات كە هیند بەجێ بهێڵێت. بەڵام هیندێكی چۆن بەجێ دەهێڵێت؟ چ هەژارییەك؟ ڕۆژێك كە خواحافیزی لە هیند دەكات، دەسەڵاتی گەورەی ئەوان بەسەر هیندا وشك دەبێت، كۆمێك لە گەندەڵی و پیسی و چەپەلی بەجێ دەمێنێت و بێ جەوهەرییەكی ڕەها ئاشكرا دەبێت.»[١٤٤] دەنگی خەمباری تاگوور دوورە لە هەر جۆرە ڕق و كینە و تۆڵە سەندنەوەیەك بەرامبەر بە ئینگلیزەكان. سەیرە لەگەڵ بوونی بێ هیوایی و نیگەرانی بەرامبەر بە ئایندەی كۆمەڵگای هیند، لەم كاتەدا تاگوور كەمتر ڕەخنە لە هاونیشتمانەكانی دەگرێت. سەرقاڵبوونی ئەو تەنیا بە چارەنووسی هیندەوە نییە، لەوانەیە زیاتر شارستانییەتی ڕۆژئاوا بێت كە لە مەترسی فەوتاندا دەبینێت: «سەردەمێك وام دەزانی كە شارستانییەتێكی هەقیقی لە دڵی ئەوروپاوە سەرهەڵدەدات، بەڵام ئەم باوەڕە لە هەیبەت كەوتووە.»[١٤٥]

قەیرانی شاستانییەت دواهەمین وتاری تاگوور نەبوو دەربارەی ڕۆژئاوا. دوو مانگ لە پێش مردنیدا لە وەڵامی نامەیەكی ئێف. ویست كۆت،[١٤٦] پێشەوای كەنیسەی ئینگلیز «ئینگلیكەن» لە هیند بە ئاوازێكی كەمتر بێ هیوایانە و ڕەشبینانە دەنووسێت: «هەقم نییە و حەزیش ناكەم حوكم لەسەر خەڵكی بەریتانیا بدەم. بەهەمان شێوە ناتوانم بەبێ دەنگی بەرامبەر بە هەڵسوكەوتی

144- Ibid, p. 330.
145- Ibid, p. 330.
146- F. . Westcott.



بەریتانیا بمێنمەوە، چونكە بێ هیچ دوودڵییەك پەیوەندی بە ژیان و خۆشبەختی ملیۆنان كەس لە هاونیشتمانەكانمەوە هەیە. من بە ویژدانەوە لە هەژاری بێ وێنە و داماوی و لاوازی و بێچارەیی خەڵك خەفەت دەخۆم و تازە ئەگەر لە كاری حكوومەت كە ماوەیەكی دوور و درێژە ئەمەیان بە ڕەوا زانیوە نەمەوێت هیچ قسەیەك بكەم...ئەوەی كە دەیبینم ئومێدێكی میهرەبانانەیە كە دڵم پێوەی گیروەدە بووە هەموو ڕۆژێك دوورتر و دوورتر دەكەوێتەوە، بێ هیواییەكی باس نەكراو سەرتاپای من دەگرێتەوە. باوەڕ بكەن هیچ كارێك لەم دنیایەدا ئەوەندە خۆشحاڵم ناكات كە ڕۆژێك خەڵكی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەست لەناو دەستی یەكتردا ببینم كە هەستاون بۆ خەبات دژی دوژمنێك كە مەعنەویەت لە ڕۆحی مرۆڤدا دەفڕێنێ.»[١٤٧]

تاگوور تا دوایین ساتەكانی هەوڵی دا ئەم هیوایەتانە بگەیەنێتە قۆناغی جێ بەجێ كردن و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە یەكتر نزیك بكاتەوە و یەكبوون بچەسپێنێت. هەر لایەك لە دڵی ئەو كۆمەڵەیەدا جێگە بگرێت و ئەو كۆمەڵەیەش هێز ببەخشێتە هەر یەكێك لەو لایەنانە. بەڵام لەو كارە نیگەران بوو كە نەوەك ئەوروپا ڕوو بهێنێتەوە خەسڵەتە سروشتییەكانی خۆی و جارێكی تر هەمان سیاسەت لە سەرتاسەری جیهاندا ڕەواجی پێبدات. لەم ڕووەوە هێز پەرستی لە ڕۆژئاوادا كە ڕوو لە گەشەبوو و دژی شارستانییەتی مرۆڤایەتییە بە توندی دەخاتەبەر ڕەخنەوە. نموونەی ئەم هێزنواندنە زاڵبوونی شارەكانە بەسەر

147- Rabindranath Tagure (The Mriad Minded Man), p. 366.

لادێکاندا. چونکە لادێکانی بە نزیکتر لە سروشتەوە دەزانی، و تا ئەوێ بەرەو پێشەوە دەچێت کە لادێکان بە لانکی شارستانییەت پێناسە دەکات و ڕەخنە لە شار دەگرێت: «لەو شوێنەدا ڕوح لە چوارچێوەی بەرددایە و ژیانی تاقەت پڕووکێن و هێز لەگەڵ هێزدا دەستەویەخە دەبێت و تاك هەمیشە عەوالّی ئەوەیە کە لەسەر حسابی مرۆڤەکانی تر بەسەرپلیکانی پێشکەوتندا سەربکەوی» .[148]

لەگەڵ ئەوەشدا چونکە دەزانێت ڕەوتی نوێخوازی ناتوانرێت بگۆردرێت، ڕێگە چارەی ڕێککەوتن و گونجان لە نێوان شار و لادێدا دەخاتە روو و بەم ئەنجامە دەگات: «ئەوشتەی لە ئەستۆی ئێمەدایە یەکپارچەکردنی کۆمەڵگا پەراگەندە هەبییەکانە، و چارەکردنی ناکۆکی نێوان شارو لادێ و هەروەها نێوان چینەکانی کۆمەڵگا و ئاپۆرەی خەڵکدا، و ناکۆکی نێوان دەسەلاتخوازی زیاتر و گیانی برایانەی ئەو کەسانەی بۆ گەیشتن بەم ئامانجە باس لە شۆڕش دەکەن، لەم خەیاڵە پووچە دان کە بە ئاسانخوازی بتوانن ڕێگەی گەیشتن بە هەقیقەت کورتتر بکەنەوە» .[149]

خاڵی گرینگ لەم ڕووەوە ئەوەیە کە تاگوور لە کاروباری ئەو کۆمەڵگا کۆمۆنیستییەی کە جێی مەستییەتی ڕێگا بە دەستێوەردانی دەوڵەت نادات. چاوی بڕیوەتە دەستپێشخەریی شارنشینەکان کە یارمەتی لادێییەکان بدەن. لەبەر هەمان هۆیە هاونیشتمانەکان بانگهێشت دەکات بۆ خزمەت لە کاری

148- Vers L' home Universel, p. 281
149- Ibid, pp. 283-284



بنیاتنانەوەی هیندا. چونکە بەبێ هاریکاریی تاکەکان لە کۆمەڵگایەکی هاوبەشدا، گەشەکردن و پەرەسەندنی مرۆیی نایەتەدی، و تەنیا لە شوێنێکدا دەتوانرێ قسە لە شارستانییەتی راستەقینەبکرێ کە کۆمەڵگای هاوبەش بە تێگەیشتنی مەعنەوی زیندوو بێت بەلاّم « هەرکە مرۆڤەکان لە دەوری ئامانجێکی ماددیدا کۆدەبنەوە، فۆرمێکی ئاپۆرەیی (مێگەلّی) دروستدەکەن کە ئیتر لەوێدا دەستەیەکی بوونەوەری زیندوونین، گەندەڵی ئەخلاقی لەگەڵ خۆیاندا رادەکێشن، ئەمە ئاکامی جێگۆڕکێ کردنی «پێشکەوتن» ی وەك پێی دەڵێن رۆژئاوایە لە جیاتی شارستانییەتی راستەقینە».

تاگوور بێ پێچ و پەنا دەڵێت لەگەڵ پێشکەوتندا ناکۆك نییە، بەلاّم لەگەڵ ڕەوتی ئەخلاقی و ڕۆحیی مرۆڤدا هاوڕا نییە. لە هەولّی ئەوەدایە دەنگی مرۆڤ لە ژاوە ژاوی مەکینەدا ببیستێت، قسەی جوان و سادەی ئەو ئەمەیە کە هەقیقەتێك لە دەرەوەی مرۆڤدا بوونی نییە. چونکە هەقیقەت لەگەڵ مرۆڤ و بۆ مرۆڤ بەرجەستە دەبێت. بڕینی ڕێگای هەقیقەتخوازی، مرۆڤ بە ناسنامەی جیهانی دەگەیەنێت. هەر ئەمەیە توندوتۆڵی (دینامیکییەتی ) شارستانییەتیڕاستەقینە . تاگوور لە ڕێگە دوور و درێژەکەی هزریدا تا ئەوێ بەرەو پێشەوە دەچێت کە لە «ئایینی مرۆڤ»دا بانگەواز دەردەکات: «مرۆڤ خاوەنی هەستێکە کە لە راستیدا دەربڕی شتێکی زیاترە لەو. دەزانێ کە ناتەواو نییە، ناتەواوە. دەزانێ کەمانایەکی تری هەیە کە پێویستە بیچەسپێنێ».